PDF 4 KURD

ناسنامەی

# کەرکووک

و

## ناوچە دابڕێنراوەکان

بەپێی بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکان

PDF 4 KURD

مەسعوود عەبدولخالق

ناسنامەی

# کەرکووك

و

## ناوچە دابڕێنراوەكان

بەپێی بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەكان

پێداچوونەوە

زیرەك ئەحمەد ڕەحمان

٢٠١٣







**خانەی موكریانی**
**بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە**

**بنكەی توێژینەوە**

- **ناسنامەی كەركووك و ناوچە دابڕێنراوەكان بەپێی بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەكان**

---

- مەسعوود عەبدولخالق

- **پێداچوونەوەی:** زیرەك ئەحمەد رەحمان

- **نەخشەسازی ناوەوە: هاوڕێ سالح**

- **بەرگ:** ڕێمان

- **نرخ:** ٢٠٠٠ دینار

- **چاپی یەكەم:** ٢٠١٣

- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە

- **چاپخانەی: چاپخانەی موكریانی (هەولێر)**

- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی كتێبخانەكان ژمارەی سپاردنی (١٦٤) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی كتێب (٧٢٠)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

PDF 4 KURD

**ناوەڕۆک**

پێشەکی یەکێتیی پەرلەمانتارانی کوردستان ........ ٧
پێشەکی ........ ٩
مەبەست لە بەڵگەنامە: ........ ١٠
یاسایی ئەو داوایە: ........ ١٠
بنەماو ڕەوایی ماددەی (١٤٠): ........ ١١
هەرچی ڕیشەی عێراقی فیدراڵە: ........ ١٣
ناوچە ناکۆکەکان (دابڕێنراوەکان) لە یاسای نێودەوڵەتی: ........ ١٧
سنووری ئەو ناوچەیە: ........ ٢٠
ئەسڵی ئەو کێشەیە: ........ ٢١
گەشە و ئاڵۆزبوونی ئەو کێشەیە: ........ ٢٢
پاساوی عروبیەکان ........ ٣٥
کورتە هەڵسەنگاندنێکی ئەو پاساوانە: ........ ٣٦
پاساوەکانی تورکمانێتیی ئەو ناوچە ........ ٤٥
کورتە هەڵسەنگاندنێک: ........ ٤٨
کوردستانیبوونی ناوچە (دابڕێنراوەکان) ........ ٥٦
سنووری سەرووی عێراق (عێراقی عەرەبی): ........ ٥٨
هەڵەیەکی کوشندە پێویستە ڕاست بکرێتەوە: ........ ٧٠
زیانی نیشتمانی لەو هەڵەیە: ........ ٧٢
بەرەو ساغکردنەوە ........ ٧٣
سنووری خوارووی ناوچە دابڕاوەکان: ........ ٨٣
جیایی کوردستان و عێراقی عەرەبی: ........ ٨٣
کامیان ڕەسەنترە ........ ٨٨
ئەو بەڵگەنامانەی موسڵ تا بەغداش بە کوردستان هەژماردەکەن: ........ ٩٢
سنووری ناوچە دابڕێنراوەکان (لە موسڵ تا کەرکووک) ........ ١٠١
ئەنجام ........ ١٢٩
چارەسەری ........ ١٢٩

## پێشەکی یەکێتیی پەرلەمانتارانی کوردستان

وشەی ناوچە دابڕاوەکان یان ناوچە جێناکۆکەکان کە زۆر لەم کێشەدا بەکارهێنراوە سەرنجی ڕاکێشاوین کە نەک تەنها لێرە بەڵکو بە فراوانی لە کاتی گفتوگۆکانی سیاسی و لە میدیاکان و لەنێو کێشەکەمان بەکاردەهێنرێت. کەچی ئەمە هەڵەیەکی زەقە و زیان بە ئەسڵی پرسی ماددەی (١٤٠) دەگەیەنێت، هەر چەندە ئەم وشەیە لە عەرەبی وەرگیراوە (مناطق المتنزاع عليها) واتە ئەو ناوچانەی لە ماددەی (١٤٠) ئاماژەی پێکراوە یەکلانەکراوەتەوە، لە ڕووی جوگرافی یان مێژوویی، کوردیش بەمە قایلبووە کارەساتاکە لێرەدایە چونکە چۆن دەبێ کەسێک لەسەر موڵکی خۆی گومانی هەبێت، لە کاتێکدا ئەوە سەلمێنراوە لە ڕووی مێژووییەوە ئەو ناوچانەی کە کێشەکەی هێنراوەتە سەر بە کوردستانە، بە تایبەتی لەسەر نەخشەی دەوڵەتی عوسمانی و پێشتریش یان وڵاتێکی سەربەخۆ بووە یان دوو ویلایەت بووە وەک: ویلایەتی موسڵ و ویلایەتی شارەزوور، کە زۆر لەو سنوورەی ئێستا فراوانتربووە، بە تایبەتی لە سەروبەندی دروستبوونی دەوڵەتی عێێراق لە ساڵی (١٩٢١) و ئەگەر بەریتانا و فەرەنسا پابەندبوونیایە بە بەڵێنەکانیان و ڕێزیان لە گفتەکانیان بگرتایە..

ماندووبوونی ئەم بە دواداچوون و لێکۆڵینەوەیە هەق نییە هەروا بەخۆڕا تێپەڕێ هەقە کاری لەسەر بکرێ.

PDF 4 KURD

## پێشەکی

لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەدواوە بەوە نەوەستان کوردستان دابەش و بێبەش بکەن، بەڵکو بە مەبەستی بچووککردنەوەی کۆمەڵێک کێشەی ڕۆژانەشی ڕووبەڕووکرایەوە، گەلێ جاریش بە زاڵمی پیشانیدەدەن کە خۆی مەزڵوومە، تەعریب کراوە بە تەکرید پیشانیدەدەن، لەوەش خراپتر هەوڵدراوە دەستکاریی ڕاستیە مێژویی و سیاسی و یاساییەکانیش بکەن، خوێنەر و نەوەی نوێ چەواشەدەکەن، ناوچە ناکۆکەکان (دابڕێنراوەکان) کە بەشێکی سروشتی کوردستانە لەژێر ناوی جیاجیا دەیانەوێ لە کوردستانی بکەنەوە، بۆ گێڕانەوەی ئەو مافەش هەر تەنها چالاکی پێشمەرگانە و دیپلۆماسی بەس نییە، پێویستی بە ئیقناعکردنی ڕای گشتی و ڕای عێراقی و ناوچەکەشە، لە دەروونی داگیرکەر بیسەپێنی کە ئەو مافە کۆن نابێت.

ئەو نووسینە سادەیەی ئێمەش بەشێکە لەو تەقەلایە، نامانەوی بیسەلمێنین ئەو ناوچانە کوردستانین، بەڵکو دەمانەوی ئاشکرای بکەین کە کوردستانیە، ناشمانەوی هیچ لایەک لەو کێشەیە زوڵمی لێ بکرێت، نە کورد زوڵم لە کەس بکات و نە زوڵمیشی لێ بکرێت، بۆ ئەوەی ئەو دووبەرەکیەی ئیستعمار لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست چاندوویەتی و تەوژمی ناسیونالیزمی عەرەبی و غەیرە عەرەبی سەرکاریەتی دەکەن دەریکێشین و برایەتیە جوانەکەی کۆن بگەڕێتەوە، کاتی نەمانەوێت ستەم لە کورد بکرێت ناشبێت دەمارگیر بین بەرامبەر بەوانەی مافیان لەو ناوچەیە هەیە لە تورکمان و ئاشووری و عەرەب و لایەنی تریش. هەوڵیش دەدەین بە بێلایەنانە بچینە نێو باسەکە، سەرچاوەی جیهانی و ئیسلامی و عەرەبی و

PDF 4 KURD

ئاشووری و تورکی و کوردی لێ بەکاربهێنین، بەهۆی بەڵگەنامەیی ڕاست و درووست سنووری ئەو ناوچانە دیاری بکرێت.

**مەبەست لە بەڵگەنامە:**

ئەو ڕاپۆرت و بەڵگەنامە ئیداری و سیاسی و جوگرافیانەی پێش کێشەکەیە، هەروەها ڕاوبۆچوونی گەڕیدە و موعجەمە کۆنەکان و ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتی و نەخشە کۆنەکانە.. کە لە سەردەمانێکی وا نووسراون کێشەی نەتەوەیی و ناسنامەی نیشتمانی نەبووە.. ئەوانە بەڵگەنامەی بێلایەنن.

**یاسایی ئەو داوایە:**

دیاریکردنی سنووری هەرێمی کوردستان بە هەموو مانا و پێوەرە یاسایی و سیاسی و ئیداریەکان ڕەوایە، فەقیهە یاساییە بەناوبانگەکانی نێودەوڵەتی دیاریکردنی سنوور بە کۆتاهێنان بە کێشە و دەستدرێژی دەزانن، نەبوونی سنوور لەگەڵ سەردەمی ئێستا و میساق و ڕێککەوتنامە نێودەوڵەتیەکان ناگونجێ، بۆیە لە هەردوو سەردەمی (عصبة الأمم) و (الأمم المتحدة) دیاریکردنی سنوورێکی ڕوون و ئاشکرا یەکێک بووە لە مەرجەکانی بە دەوڵەت و ئەندام بوون لەو دەزگا نێودەوڵەتیە، تەقەلا مانای جیابوونەوە نییە، بەڵکو چۆن ئوستانێک یان شارێک پێویستی بە دیاریکردنی سنووری شارەوانی ئیدارەکەی لەگەڵ شارێکی تری هەمان وڵات هەیە، ئاواش ئەو هەرێمە پێویستی بەو دیاریکردنە هەیە، هەرێمی کوردستان دەستووریە و لە ساڵی (١٩٧٥)ەوە

بە یاسای فەرمی دیاریکراوە[1]، نەدەبووایە دەوڵەتی عێراقی (لایەن) بووایە لەو کێشەیە، بەڵکو کێشەکە لەگەڵ ئەو هەرێم و شارانەی کە سنووری کەوتۆتە سەر ئەو ناوچانە بووایە، بەڵام حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراقی بە ئاشکرا دەستیان لە دروستکردنی ئەو کێشەیە هەبووە، بۆیە کێشەکە ڕووبەڕووی ئەو بوویتەوە، هەر بۆیەش وا پێویست دەکا لایەنی نێودەوڵەتی سەرپەرشتی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە بکات، بەتایبەتی کە عێراق لەژێر بەندی (٧)ـدایە، لەو ڕووەوە دیپلۆماسی کورد کەمتەرخەمە.

**بنەماو ڕەوایی ماددەی (١٤٠):**

نەما و ڕەوایەتی دەگەڕێتەوە بۆ دوو تەوەر: یەکەمیان بنەما یاساییەکانی هەرێم و عێراق، تەوەری دووەم بریتیە لە بوونی مێژوویی هەرێمی کوردستان...

## یەکەم: بنەما یاساییەکانی(هەرێمی کوردستان) و (عێراقی فیدراڵی)

بۆ ئەوەی بتوانین یاساییانە کێشەی ناوچە ناکۆکەکان بە (مناطق المتنازع عليها) وەسف بکەین، ئینجا بارێکی یاسایی بدەینە ئەو کێشەیە،، پێویستمان بە دیاریکردنی باری یاسایی هەرێمی کوردستان و پەیوەندیی لەگەڵ بەغدا هەیە، بەو شێوەی خوارەوە:

---

١. لە (١١/ ٣/ ١٩٧٤) یاسای ئۆتۆنۆمی جاڕدرا بۆ ئەو ناوچانەی زۆرینەی کوردن و بە پێی ماددەی (١)ـی ئەو یاسایە کوردستان (منطقة الكردستان) بووە کیانێکی یاسایی، لە بڕگەی (ج)ی ماددەی (١)دا شەخسیەتی مەعنەویشی پێدەدا..



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

١. پێش دروستبوونی دەوڵەتی عێراقی لە ساڵی (١٩٢١) هەرگیز کورد و عەرەب (کوردستان و عەرەبستان) لەنێو عێراقێکی سیاسی پێکەوە نەژیاون، برابووینە، بەڵام لە چوارچێوەی (دار الإسلام) نەک (دار العراق).

٢. ئەو ناوچەیەی دوای ناوینرا عێراق یەک ویلایەت نەبووە، ویلایەتەکانی شارەزوور (دوای بووە موسڵ)، بەغدا، بەسرە بووە.

٣. لە کاتی دروستبوونی دەوڵەتی عێراقی کوردستان (لەو کاتیەوە بووە کوردستانی خواروو، دواییش بووە کوردستانی عێراق، دواجار بووە: شمال العراق"!) خاوەنی دەسەڵات و هەرێمی خۆی بووە، شەرعیەتیشی هەبووە بە پێی رێککەوتنی سولْتان - بەدلیسی، دوای ویلایەتێکی سەربەخۆش بەناوی ویلایەتی کوردستان هەبووە، یەک لە والیەکانی (حەمدی پاشا)ی کورد بووە[١]، لە دواساتەکانی تەمەنی عوسمانیش بە پێی بروسکەی عەلی ئیحسان پاشای نوێنەری سوڵتانی عوسمانی لە (١٩١٨) بۆ شێخ مەحموود کە دان بە حکومەتی شێخ مەحموود دەنێ لە کوردستان.

٤. لە رێککەوتنە نێودەڵەتیەکان.. کوردستان خاوەنی هەرسێ پای دەوڵەت (هەرێم و گەل و دەسەڵاتی سیاسی) [ماددەی (١)ی رێککەوتنامەی مۆنتیفیدۆ-١٩٣٣]. چ جای فیدراڵی بووە، کە مەشموولە بە ماددەی (١)ی بەشی یەکەم و ماددەی (٥٥)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان، ماددەکانی (٥٨-٦٠)ی (الفصل العاشر- قبول أعضاء جدد)ی (مجلس الامن)، بڕیارەکانی (ژ:١٥١٤)ی خولی (١٥)ی

---

١. بڕوانە (د. عثمان علي، الكرد في الوثائق العثمانية، ص١١٤، ١١٥، ١١٨، ١٢١) لە یەکێ لەو بەڵگەنامانەی بە مۆری والی کوردستان کراوە بەناوی (احمد عزت).

(١٤/دیسـەمبەر/١٩٦٠)، بڕیـاری (ژ: ٢١٠٥) خـولی (٢٠)ـی دیسـەمبـەری (١٩٦٥)، بڕیاری (ژ:٢٦٢٥)ی خولی (٢٥)ی (٢٤/ئۆکتۆبەر/١٩٧٠)، بڕیـاری (ژ: ٣٠٧٠)ی خولی (٢٨)ی نۆڤمبەری (١٩٧٣)... هەموو ئەمانە داکۆکی لـە مـافی چارەنووسـی گـەلان دەکـەن کـە پاسـاو و مقـەوماتی یاسـای نێودەوڵەتیە بۆ هەرێمی کوردستان.

٥. لە نێوان کوردستان و عێراق: مەرجەکانی لکاندنی کوردستان بە عێـراق لـە: ڕاپـۆرتی گەڕانـەوەی ویلایـەتی موسـڵ، دەسـتووری (١٩٢٥)، بەڵێنی حکومەتی بەریتانی و عێراقی هاوبەش، بەڵێنی عوسبە لـە (١٩٢٢)، دە (١٠) بەڵێننامـەکـە، دەسـتووری (١٩٥٨)، بـەیانی (٢٩)ـی حـوزەیران، بەیانی (١١)ـی ئـازار و یاسـای ئۆتۆنـۆمی (١٩٧٤)، بەندی (٧) و بڕیـاری (٦٨٨)، بڕیاری (٩٨٦) کە ڕێژەی (١٣%) تایبەت لە خۆراک بۆ کوردستان دیـاریکرا لـە لایـەن نەتـەوە یـەکگرتوەکان...، یاسـای ئینتیقـالی (٢٠٠٣)، دەستووری نوێی عێراقی..هاتووە.

## هەرچی ڕیشەی عێراقی فیدراڵە:

١. بـۆ دروسـتکردنی دەوڵـەتی عێـراقیش پـرۆژەی لـۆرانس بـۆ (٢) هەرێمی عێراقی بەناوی (عێراقی سـەروو- بەغدا بۆ مـەلیک عەبدوڵڵای برا گەورەی مەلیک فەیسەڵ)، (عێراقی خواروو- بەسرە بۆ ئـەمیر زەیدی برا بچوکی) مەلیک فەیسەڵیش بۆ سوریا دیاریکرابوو[1].

٢. پرۆژەی بەریتانیا بۆ تەواوی ناوچەکە بەو شێوەبوو:

أ- ناوچەکانی شیعە سەربەخۆ بێت..

---

١. بڕوانە: د. علي الوردي، لمحات من تاريخ العراق، ق١، ج٥، ص ٥٨.

ب- ئیدارەی بەسرە لە بەغدا جیا بێت و کوێتیشی بخریتە سەر.
ج- بەغدا مەملەکەتێکی سەربەخۆ دەبێت و دەدرێتە پادشایەکی عەرەبی.
د- هەموو ئەوانە تەنها بەناو عەرەبی لەژێر دەستی بەریتانیا دەبێت[1].

٣. لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتی هاوچەرخ بناغەی سێ دەوڵەت لە خوارو (کەربەلا/ ١٩١٨-١٩٢٠) و ناوەڕاست (بەغدا/١٩٢٠-...) و لە کوردستان (سلێمانی/ ١٩١٨-١٩٢٣) دروستبوو.

٤. تەقەلاکانی دروستکردنی فیدراڵی لە خوارو:

أ- پرۆژەی لۆرانس بۆ سەربەخۆیی بەسرە، پرۆژەی لکاندنی بەسرە بە دەسەلاتی هندەوە، پرۆژەی فیدراڵی بەسرە بە سەرۆکایەتی تاڵیب پاشا، دواییش پرۆژە بە ناوبانگەکەی (١٩٢١/٦/١٣)ی خەڵکی بەسرە لە کەسایەتیە بەناوبانگەکان و مەسیحی و یەهوودیشی تێیدا داوایان کردبوو سەربە خۆیی بدرێتە ویلایەتی بەسرە[2].

ب- تەقەلاکانی (فوراتی ناوەڕاست) کە بریتین لە: حکومەتی کەربەلا، شۆڕشی (٢٠)، تەقەلاکانی ئال کاشف غیتا (غطاء)، هاوپەیمانی فوراتی ناوەڕاست و بەکر سدقی، بە گشتی هاریکاریی ڕابەرانی شیعە لەگەڵ سەرکردە کوردەکان لەگەڵ شێخ مەحموود، مەلا مستەفا.

٥. نەگونجانی سێ پێکهاتەکان لەژێر سایەی دەسەلاتی مەرکەزی، سەرهەڵدانی پشێوی لە نێوانیاندا.. لە کوردستانیش بزووتنەوەکانی شێخ مەحموود تا ساڵی (١٩٣٢)ی خایاند، بزوتنەوەی شێخ ئەحمەد، ئینجا لە ساڵی (١٩٣٥) بزووتنەوەی بەکر سدقی لە شێوەی ئینقلاب لە بەغدا

---

١. موسوعة العراق السياسية، ص٩٣.
٢. بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات، ج ١، ص١٠٠.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

ڕوویدا بۆ گێڕانەوەی مافی سروشتی کوردستان، دوای جەنگی دووەمی جیهانیش سەرهەڵدانی حزبە کوردستانیەکان و شۆڕشی ئەیلوول و... لەوساوە تا ئێستا دیار و زانراوە.

## دووەم: بوونی مێژوویی کوردستانی سیاسی

١. مێژوویی - بوونی هەرێمی کوردستان بە سنوورێکی دیاریکراو زیاتر لە (٨) سەدە وەک لەو توێژینەوەی بەردەستتدایە.

٢. نێودەوڵەتی - هەرێمی کوردستان لە سەردەمی عوسمانی وەک ویلایەت بووە و دوایش لە ڕێککەوتنامە نێودەوڵەتیەکان دانی پێدانراوە بەتایبەتی لە سیڤەر و سان ڕیمۆ.

٣. لەسەر ئاستی عێراقیش: هەر لە مەرجەکانی (تقرير ولاية الموصل، ص٢٢٨) سەبارەت بە یەکگرتنی عێراق و کوردستان، ئینجا ماددەی (١٦)ی ئینتداب، ماددەی (٤)ی کۆنگرەی قاهیرە، داننانی بەریتانی لە (١٩١٩) بە چارەنووسی کوردستان و جارێکی تر لەگەڵ عێراق لە (٢/دیسەمبەر/١٩٢٢)، بڕیارەکانی خولی (١٦)ی مانگی (١٩٢٥/١٢)ی عوسبە سەبارەت کورد، (١٠) بەڵێننامەکەی ساڵی (١٩٣٢) کە بە عوسبە درا بە تایبەتی (بەڵێننامەی ژ:٩ و١٠)...، و دانی پێدانراوە لە: (١٩٣٦، ١٩٥٨، ١٩٦٦) .. ڕێککەوتنی (١١)ی ئاداری (١٩٧٠) تێیدا دان بە بوونی یاسایی ناوچەی کوردستاندا نرا وەک یەکەیەکی ئیدارییش[١]، لە کۆنگرەی (٧)ی حزبی بەعس دان بە بوونی کورد لە عێراقدا نراوە، لە (١٩٧٤/٣/١١)دا بڕگەی(ج)ی ماددەی (٨) دەستووری هەموارکراوی

---

١. خاڵی (١٤)ی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار.

PDF 4 KURD

ساڵی (١٩٧٠) تێیدا داننرا کە هەموو ئەو ناوچانەی زۆرینەی کوردن وەبەر ئۆتۆنۆمی دەکەون، لە (١٩٧٤/٣/١١) یاسای ئۆتۆنۆمی جاڕدرا بۆ ئەو ناوچانەی زۆرینەی کوردن، ئەو یاسایە گرنگیی خۆی هەیە بۆ ئەو کێشەیە زیاتری لەسەر دەوەستین:

بە پێی ماددەی (١)ی ئەو یاسایە (منطقة الكردستان) بووە کیانێکی یاسایی، لە بڕگەی (ج)ی ماددەی (١) شەخسیەتی مەعنەویشی پێدەدا، ئەوەش یاساییانە مافی ئەوەی دەداتی سنووری خۆی دیاری بکا، لە بڕگەی (ب)ی ماددەی (٢) عەرەب و کەمینەکانی تر لەو ناوچە بۆ بەشێک لە وەحدە ئیداریەکەی (منطقة الكردستان) پۆلێندەکا...، تا دەرچوونی [ماددەی (٥٨)ی قانون إدارة الدولة الإنتقالية] لە (٢٠٠٤)، دوایش ماددەی (١٤٠)ی دەستووری نوێ، لەسەر ئاستی نێونەتەوەیش لە بڕیاری (ژ:١٧٧٠)ی ڕۆژی (٢٠٠٧/٨/١٠)دا لە دانیشتنی (ژ: ٥٧٢٩)ی نەتەوە یەکگرتوەکان سەبارەت بەو ناوچە و دیاریکردنی (ستیڤان دیمستۆرا) بۆی.

٤. مادام هەرێمێکی دیاریکراوی هەیە و گەلێکی جیای لەسەر دەژی ئەوا بنەما یاسا نێودەوڵەتیەکانی چارەنووس دەیگرێتەوە کە بریتیە لە:

ڕێککەوتنی سوڵتان و کورد لە (١٥١٤)، ئاماژەکانی کۆنگرەی بەرلینی (٢/ یۆلیۆ/١٨٧٨)، بنەماکانی جامیعەی ئیسلامی، ئینجا کۆنگرەی پاریسی (١٩٠٢)... تا دەگاتە بنەماکانی مافی چارەنووس لە (١٤) خاڵەکەی ویلسنی (١٩١٨) و لێدوانە هاوبەشەکەی بەریتانی – فەڕەنسی لە (١٩١٨)، کۆنگرەکانی سان ڕیمۆ و سیڤەر لە (١٩٢٠). هەروەها لە سەردەمی نەتەوە یەککگرتوەکانیش هەروەک لە سەرەوە نیشاندرا.

PDF 4 KURD

٥. تەنانەت ماددەکانی (٣٨-٤٠)ی لۆزانیشی کە نزیکە لە ماددەکانی (١٤١ و ١٤٥)ی سیڤەر پاڵپشتیدەکا کە تێیدا هاتووە: جیاوازی نەکا لەسەر بنچینەی زمان و ڕەگەز و ئاین و چارەنووسیان بە پێی زۆرینەییان لە ناوچەکە دیاری بکرێت لە ڕێگەی ڕاپرسی.

٦. لە کۆتایدا ئەوە واقعی مێژوویی یاسایی هەرێمی کوردستان بووە (کە بنەما و ڕەوایی دەسەلمێنی)، لە حکومەتی نوێی عێراق پاش (٢٠٠٣) بە فەرمی لە برگەی (ب)ی ماددەی (٥٨)ی (قانون إدارة الدولة الإنتقالية) دان بە بوونی پرۆسەی تەعریب و دەستکاری سنووری ئیداری دەنێت دژ بە کوردستان لەو ناوچەیە کراوە، ئەوە لە هەموو بەڵگان بەڵگەترە کە ڕەوایی پێدەدا، لە سەردەمی حکومەتی بەعسیش دان بە تەعریب نراوە دژ بە کورد لە خاڵی (٨)ی ڕێککەوتنامەی (١١)ی ئاداری (١٩٧٠).

### ناوچە ناکۆکەکان (دابڕێنراوەکان) لە یاسای نێودەوڵەتی:

لە کۆندا لەسەر ئاستی گوند و شار ناکۆکی لەسەر تخوب هەبووە، لەسەر ئاستی میرنشین و ئیمپراتۆریەتیش لەسەر سنوور هەبووە، ئەوەی یەکەم لەو شوێنانەی دەسەلاتی حکومەت هەبووایە بە یاسا یان بە شەرع (جاریش وابووە بە نەریت) چارەسەرکراوە، بەلام لە نێوان ئیمپراتۆر و حکومەتەکان کەمتر بە یاسا چارەسەرکراوە، بۆیە سنوور لەژێر پێی دوا سەربازی شەڕکەردا بووە، ئیتر بەردەوام سنوور گۆڕاوە و ناوچەی ناکۆکی لێ دروستبووە، زۆربەی جەنگ و ناکۆکیەکان بە هۆی سنوور بووە، دوو جەنگی جیهانی لێ سەریهەڵدا.

دوای ئـــەوەی یاســـای نێودەوڵـــەتی خـــەملی و دەوڵـــەتانی مـــۆدێرن دروستبوون بە سنوورێکی نێودەوڵەتیەوە، کۆمەڵێک کێشـە بـەناوی ناوچـە ناکۆکەکان (المناطق المتنازع علیها) سەریهەڵدا بە تایبەتی لە کاتی دارشتنی سـنوور لـەنێو وڵاتـانی عەرەبیـدا خەسـت تـر بـوو چونکـە زۆربـەی ئـەو سـنوورانەی بۆیـان دیـاریکراوە دەسـتکردە و بنەچەیـەکی مێژوویـی و یاسایی و سروشتی نییە.. لـە نێوانیشیاندا عێراق لـە هـەمووان زیاتر ئـەو کێشەیەی هەم لەگەڵ دەوروبـەر و هـەم لـە نـاوەخۆش هەیە، تـا ئێستا بـە چارەسەرنەکراوی بەجێماوەتەوە، هەندێ جار بـەهۆی چارەسـەر نـەبوونی (ناوچە ناکۆکەکان) بۆتە دەوڵـەتێکی سـەربەخۆ وەک ئـەو کێشـەیەی نێوان ئەرجەنتین و بەرازیل لە (١٨٢٥) ڕوویدا لەسـەر ئۆرگـوای و شـەڕ ڕوویدا و لـە ئاکامـدا لـە (١٨٢٨) وا ڕێککـەوتن کـە ئۆرگـوای ببێتـە دەوڵـەتێکی سـەربەخۆ، هنـد و پاکسـتانیش لـە (١٩٤٧) ئـەو کێشـە و شـەڕەیان دروسـتبوو، بـووە هـۆی دروسـتبوونی بـەنگلادیش لـە (١٩٧١)، ئێسـتاش بیابـانی ڕۆژئـاوا نێـوان جزائـر و مـەغریب و مۆریتانیـا بـەو ئاڕسـتەیەدا دەڕوات، هەنـدێ وڵاتـانی تـریش ئـەو کێشـانەیان هـەروا مـاوە، لەوانـە: ئـەرمینیا لەگـەڵ ئازەربیجـان لەسـەر نـاگۆرنی کارەبـاخ، ئیمـارات لەگـەڵ سعودیە و لەگەڵ ئێران، نێوان ئیسرائیل و فەڵەستین، نێوان یابان و چین، نێوان بەریتانیا و ئەرجەنتین.. ئەوەی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی کـەمێک بـە کێشـەی ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان دەچـێ ناوچـەی (سـەدتنلاند) نێوان ئەڵمانیا و چیکۆسلۆڤاکیا بوو، کە ڕێککەوتنامـەی (میونیخ) لـێ مۆرکرا لـە (٣٠/سیپتەمبەر/١٩٣٨)، سەدتلاند (٨٠٠) هەزار چیکی و نزیکـەی (٣) ملیۆن ئەڵمانی لێ بوو، بڕیاریاندا وەک بڕیارێکی نێودەوڵەتی (ئـەڵمانیا و فەڕەنسـا

و ئیتالیا و چیکۆسلۆڤاکیا) کە بە ڕاپرسی ئەو کێشەیە چارەسەربکرێ لە چوارچێوەی مافی گەلان لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان، یەکەم کۆنگرە کە گرنگیی بە سنوور دابێت فردانی (٨٤٣ز) و مارسینی (٨٧٠ز)، بە پێی بڕگەی (٢)ی ماددەی (١) و بڕگەی (٣)ی ماددەی (٥٢)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان چارەی ناوچە ناکۆکەکان بە ڕاپرسی بووە، هەروەک لە نێوان چیک و ئەڵمانیادا کرا، لە (١٩٤٩/٥/١١) نەتەوە یەکگرتوەکان بڕیاری (ژ٢٧٣)ی دەرکرد بۆ دیاریکردنی سنوور و بەرقەراری ئاشتی نێودەوڵەتی، جا دەوڵەت بێت یان هەرێمی فیدراڵی و ئۆتۆنۆمی بێت.

لە ڕاستیدا لە نێوان ئەو دەوڵەتانە مانای (ناوچە ناکۆکەکان) یاساییانە دەبێ، لە نێوخۆی وڵاتێک کەمتر ئەو ناوە یاساییەی پێدراوە، لەوانە: ناوچە ناکۆکانی نێوان ئیسرائیل و دەسەڵاتی فەڵەستین سەبارەت بە (زەمینی داگیرکراوی ١٩٦٧)، نێوان دەوڵەتی سوودانی و حکومەتی هەرێمی خواروو لەسەر ناوچەی (ئەبیە)[١]، دوا بە دوای دروستبوونی عێراق لە (١٩٢١) هەر کاتی دیاریکردنی (هەرێمی کوردستان) هاتبێتە پێش ئەوکێشەیە هەبووە لە: (١٩٣٦، ١٩٥٨، ١٩٦٦، ١٩٧٠، ١٩٧٤، ١٩٨٣، ١٩٩١) تا دەرچوونی، ماددەی (٥٨) لە (قانون إدارة الإنتقالية-٢٠٠٤)، دوایش ماددەی (١٤٠)ی دەستووری، لەسەر ئاستی نێو نەتەوەیش لە بڕیاری (ژ:١٧٧٠)ی ڕۆژی (٢٠٠٧/٨/١٠) (دانیشتنی ژ: ٥٧٢٩) سەبارەت بەو ناوچە و دیاریکردنی (ستیڤان دیمستۆرا) وەک نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ناوچە ناکۆکەکانی دەوروبەری کەرکووک.

---

١. کێشەی (ئەبیە) زۆر وێچووی کێشەی کەرکووکە، ئەویش دانیشتوانی هەردوولا ناکۆکەکەی لەسەرە (هۆزێکی سەر بە باکوور و هۆزێکی تری سەر بە باشوور) هەمان شت ناوچەیەکی نەوتییە.. بەڵام لەوێدا تەعریب نەبووە.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

لەدوای (٢٠٠٣) لە چوارچێوەی دەستووری عێراق زاراوەی ناوچە ناکۆکەکان سەری هەڵدا، لە لایەک ئیجابیە کە ناوێکی یاسایی لێنراوە وەک ئەوە بێت لە نێوان دوو دەوڵەتدا، لە لایەکی تریش سەلبیە چونکە بە مسۆگەر ئەو ناوچەیە کوردستانیە بیدەیتە (ناوچەی ناکۆک) کە شەریکێکی لە خۆڕایی بۆ خۆت پەیدا دەکەی.

**سنووری ئەو ناوچەیە:**

زۆر جۆرە هۆکارهەیە بکرێتە پێوانە بۆ چارەسەرکردنی کێشە و دیاریکردنی سنووری نێوان دوو دەوڵەت و دوو میللەت و دوو هەرێم.. بریتین لە:

١. سنووری جوگرافی کە بریتیە لەبەربەستێکی سروشتی نێوانیان وەک چیا و ڕووبار و دەریا..

٢. سنووری مێژوویی واتە ئەو ناوچەیە هەرلەژێر دەستی ئەو میللەتە بووە و دەسەلاتی سیاسیان بەسەردا زاڵ بووە وەک: ئەمریکا، بەریتانیا، ئێران، ڕووسیا...هتد.

٣. لەسەر بنچینەی ڕەگەزی و ئاینی واتە سنووری لەگەڵ سنوورێکی تر بەوە دیاری بکرێت کە زۆرینە ناوچەکە لە ڕووی ڕەگەزی و ئاینی لە کام لا زیاتر بوو لە سەردەمی نوێدا مافی چارەنووس و زۆربەی ڕێککەوتنامە نێو دەوڵەتیەکانیش لەسەر ئەو بنچینەیە دروست.

هەر میللەت و ولاتێک خاوەنی ئەو جۆرە سنوورانە نەبێ سنوورەکانی (دەستکرد)ی پێ دەگوترێ و ئاسایی کێشەی سنووری

هەیە چ لە ناوەخۆ چ لەگەڵ دەرەوە، عێراق نمونەیەکی زەقی ئەو جۆرە کێشەیە، جگە لە ئوردن و سووریا کە پێکەوە دروستکران بە پێی ماددەی ٩٤ی سیڤەر ئەگینا لەگەڵ هەموو لایەک کێشەی سنووری هەیە، لەگەڵ تورکیا بۆیەکەم جار لێژنەی (عصبة الأمم) هات بە دوو ساڵ ئینجا توانیان سنوورێک بەناوی برۆکسل[1] دیاری بکەن، لەگەڵ سعودیە و کوێت و ئێران تائەو ساتە کێشەی سنووریان ماوە، لە ناوەخۆش کێشەی سنووری لەگەڵ کوردستان هەر هەبووە، ئێستا بریتین لەو ناوچانەی سەرووی ویلایەتی موسڵ یاخود ئەو سنوورەی کە لە کێشەی (ویلایەتی موسڵ) دیاریکراوە، ئەو شارو شارۆچکانەش دەگرێتەوە: شنگار - شێخان - گوێڕ - مەخموور - دیبەگە -سەرگەڕان - دوبز - پردێ - کەرکووک - قەرەتەپە - داقوق - دووز- مەندەلی - خانەقین .. کە دەکاتە لە (٤٢%)ی کوردستانی خواروو.

## ئەسڵی ئەو کێشەیە:

هەڵبەتە سەرچاوەی هەموو کێشەکان لە دابەشی و بێبەش کردنی کورد دێت کە لە دابەشیەکانی میراتی عوسمانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە ڕێککەوتنەکانی سایکس- بیکۆ (١٩١٦) تا لۆزانی (١٩٢٣) دێت، بەلام خودی ئەو کێشەیە ڕیشەیەکی تایبەتی بە خۆشی هەیە، یەکەم جار لە ساڵی (١٩١٦) لە ماددەی (١)ی ڕێککەوتنی سایکس- بیکۆ

١. سنوورێک بە ناوی برۆکسل بە ئاشکرا گوزارشت لەوە دەکات کە ئەم سنوورە هیچ بنچینەیەکی جوگرافی و ڕەگەزی و ئایینی و مێژوویی نییە، بۆیە ئەم ناوەیان لێنا چونکە لە شاری برۆکسل دوا مۆری پێو نرا، وەک سنووری (کیرزۆن)ی نێوان ڕووسیا و پۆڵەندا.

PDF 4 KURD

ئەو ناوچەیە جیاکرایەوە پیتی (B)ـی پێدرا، بەڵام نەخرایە سەر عێراق تەنها خرایە بەشی بەریتانی، دوای ئەوەی بەریتانیا عێراقی دروستکرد و سنووری بۆ زیادکرد لە عێراقی عەرەبی تێپەڕی بۆ عێراقی عەجەم و دوایش کوردستانی خواروشی گرتەوە، ئینجا بیر لە تەعریب کردنی ئەو ناوچانە کراوە، یەکەم تەعریب لە لایەن بەریتانیا کرا ویستی شێوازێکی عەرەبی بداتە ویلایەتی موسڵ لە کاتی کێشەکەی ئەو ویلایەتە لە (١٩٢٣-١٩٢٥)، بە تایبەتی ناوچەکانی کەرکووک تا موسڵ پرۆسەی تەعریب بەناڕاستەوخۆ دەستپێکرد لە حکومەتی (یاسین هاشمی)ـیەوە[١] تا (١٩٦٣)، لە دوای ئینقلابی حزبی بەعس لە (١٩٦٣ و ١٩٦٨) بە ڕاستەوخۆ و بەرنامەی ڕێژی دەستی پێکرد.

### گەشە و ئاڵۆزبوونی ئەو کێشەیە:

هەر کێشەیەک ڕەهەندێ تری بەدەر لە لایەنە ئاساییەکانی خۆی بە سەلبی بەشداربن زیاتر ئاڵۆز دەبێ، ئەو کێشەیەش زیاتر بەوەی ئاڵۆز بوو لایەک لێی باڵادەست بووە و پشتیوانی نێو دەوڵەتیش هەبووە، لای تریشی ژێردەستەو لاواز بووە، سەرەڕای ئەوەش چەند هۆکارێکی تر ئەو کێشەیەی دروست و ئاڵۆزتر کردوە، ئەوانەی خوارەوەیە:

١. جیاکردنەوەی ئەو ناوچەیە بەر لە پرۆسەی تەعریب: یەکەم جار ئەو ناوچەیە لە ڕێککەوتننامە شومەکەی سایکس-بیکۆی (١٩١٦) لە

---

١. بۆیەش بەکر سدقیی کورد بیری لە کودەتا کرد و لە (١٩٣٦) پەیڕەویکرد- بڕوانە یاداشتەکانی مەندووبی ئەڵمانیا لە عێراق فریتز گروبا (العراق في مذكرات الدبلوماسيين الاجانب).

PDF 4 KURD

ویلایەتی موسڵ جیاکراوە، لە ماددەی (١)ـی ئەو ڕێککەوتنە بە ڕوونی ناڵێت ناوچەی (B)بۆ دەوڵەتێکی عەرەبی ئامادە دەکرێ.

ناوچەی (B) نێوان هەردوو هێڵی پانیی (٣٤. ٣٥) دەگرێتەوە[١]، باقی ویلایەتی موسڵ درا (فەڕەنسا)، دوای لە کۆنگرەی سان ڕیمۆی (١٩٢٠) بەریتانیا فەڕەنسای قایلکرد ویلایەتی موسڵ بداتەوە بەریتانیا، لەو لایەش تورکیای نوێ بە سەرکردایەتی ئەتاتورک دانی بەوە نەنا کە ویلایەتی موسڵ موڵکی تورکیا نەبێ، هەروەک لە (میساقی تورکیا/ ماددەی-١-)[٢] وای تۆمارکردبوو، پاساویشی ئەوەبوو کە ئەو ناوچەیە لە دوای ئاگربەستی مودرەسی (١٩١٨) و جەنگی جیهانی (١٩١٤. ١٩١٨) داگیرکراوە، تا لیژنەی عوسبە هات، دای بە بەریتانیا و ئەویش عێراقی لێ دروستکرد.

٢. دوای ئەو هەنگاوە سیاسەتی بەریتانیا وابووە کەرکووک لە کوردستان جیا بکاتەوە، تاگەیشتە شێوەی فەرمی لە (١٩١٩) بە فەرمی کاپتن ستیڤان لۆنکرینگ (جێگری حاکمی کەرکووک) کەرکووک لەژێر دەسەڵاتی کورد دەربهێنرێت[٣].

٣. ئەو ئامار و نەخشانەی بەریتانیا پێشکەشی لیژنەی (عصبة الأمم) کرد لە کێشەی ویلایەتی موسڵ و لە تەقەلای بەزۆر لکاندنی خوارووی کوردستان بە عێراقی عەرەبی زیاتر ئەو کێشەیەی ئاڵۆز کردوە، چونکە ناسنامەی دەوڵەتی پێشنیارکراوی عێراق لە ڕێککەوتنامەکانی سایکس

---

١. بڕوانە نەخشەی سایکس بیکۆ.

٢. ئەو میساقە لە (٢٨/ ١/ ١٩٢٠) دەرچووە و لە (٥) ماددە پێکهاتووە.

٣. سیاسة البریطانیا العظمی.. ص ١٠٠.

PDF 4 KURD

پیکـۆ و سـان ڕیمـۆ و سـیڤەر بـە ناسـنامەیەکی عـەرەبـی هـاتبوو سنوورەکەشی کەمێک سەرووی بەغدا تا بەسرە، بۆ ئەوەی کوردستانی خوارووش بلکێنرێ ئەوا بەریتانیا ناچار ئامار و خشتەی چەواشەی لەسەر کوردستان بڵاودەکردەوە بەلای عەرەبی دەشکاندەوە، وەک نموونە دەڵێ عەرەب لە سلێمانی زۆرە، ئینجا بەوەش نەوەستا لە ئاماری (٢٠/کانونی یەکەم/١٩٣٠)دا دەڵێ: کەرکووک (٣٠%)ی عەرەبە (٢١%)ـی تورکمانە و (٥%)یش کوردا!.

٤. یاسای ئۆتۆنۆمی ساڵی (١٩٧٥) کە لە لایەن حکومەتی عێراقەوە دەرچوو، دیسان ئەو ناوچانەی لە هەرێمی کوردستان جیاکراوە کە بە (منطقة کردستان للحکم الذاتي) ناوبرا.

٥. دەرچوونی بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتوەکانی پابەند بە بەندی (٧)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان هەر هەمووی ئەو ناوچانەی بەدەر لە هەرێمی کوردستان پۆلێنکرد، بەر لە هەموویان ناوچەی ئارامی سەرووی هێڵی (٣٦)، ئینجا بڕیاری (٩٨٦)ـی نەوت بەرامبەر خۆراک ڕێژەی (١٢%) بۆ کوردستان هەژمارکرد کە تەنها پارێزگاکانی دهۆک و هەولێر و سلێمانی دەگرتەوە.

دوای داگیرکردنی ئەمریکاش هەر لەسەر ئەو سیاسەتە ڕۆیشت.

٦. دەسەڵاتی کوردی لە ماوەی (١٩) ساڵ لە حوکمی نەیتوانی سەرکەوتوو بێت بۆ گێڕانەوەی ئەو ناوچانە، کارنامە یاسایی و سیاسی و ئەخلاقی و ئابووریەکانی سەبارەت بەو ناوچەیە لاواز بوو، ئینجا کێشەیەکی وا ئاڵۆز و گەورە بە نەخشە و پلانێکی بچووک و خەمسارد ناکرێت، لە هەمووی گرنگتر نەیانتوانی سەرنجی پێکهاتەکانی تر لە

PDF 4 KURD

تورکمــان و ئاشــووری و عــەرەبی ناوچەکــە بــۆ لای خۆیــان ڕاکێشــن، ئەوانیش زیاتر بەلای عەرەبە شۆڤێنیەکان لاربوونەوە، ئەگەرچی هەندێ ولاتی دەوروبەر ڕێگر بوون بەلام ئەوە پاساوی ئەوە نادات کە پاکانە بۆ هەڵسوکەوتی بەرپرسانی کورد بکەین سەبارەت بە داخوازیەکانی تورکمان و ئاشووری وەک پێویستە نەبوون، لەسەر (حەق) نەیانتوانی ئەوانە ڕاکێشنە ڕیزی خۆیان کەچی لایەنی بەرامبەر لەسەر (باتیل) توانی ئەوانە ڕاکێشێن.

٧. هەر خودی ئەو هۆکارانەی بوونە ئاڵۆزی کێشەی کورد لێرەش هەمان ڕۆڵ دەبینن، لەو دەمە لە هەمووان زەقتر ولاتانی هەرێمی و جامیعەی عەرەبی دژ بەوەن کە ناوچە ناکۆکەکان ناسنامەی کوردستانی بدرێتی.

٨. لە هەموی ئاڵۆزتر ئەوەبوو حکومەتی عێراق خۆی لایەن بووە لە ئاڵۆزکردنی، خۆی هەڵساوە بە تەعریب و کێشە دروستکردن، گوێی بە (١٠) بەڵێنامەکەی وەرگیرانی لە (عصبة الأمم) و (بەڵێنەکانی ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ)، یاسای نێودەوڵەتی و ئەسڵی مانای دەوڵەتبوون و پارێزگاری و نوێنەرایەتیکردنی هەموو لایەک بە یەکسانی نەکردوە، هەستاوە بە تەعریب کە بەشی هەرە بنچینەی ئاڵۆزکردنی کێشەکەیە و خستوومانەتە دوا برگەوە.

٩. تەعریب: لە کۆنەوە تەقەلایەک لە لایەن نووسەری عەرەبی ئیسلامی هەبووە تا ناوی شار و ولاتەکان بە زمانێکی پیرۆز و ڕەسەن گوزارشت بکا، کە ئەوساکە واباوکرا ئەو زمانە عربیە، لە سەردەمی عەبدولملیکی کوڕی مەڕوان(٦٥-٨٦ک) بۆ تۆماری باج (خراج) زەوی

PDF 4 KURD

ناوەكان لە هەموو وڵات بە عەرەبی تۆماركران، هەر لە سەردەمی ئەو لە (٧٥ك) بەرامبەر (٦٩٦ز) زمانی عەرەبی كرایە تاكە زمانی فەرمی نەك هەر لە دەوڵەت بەڵكو بۆ تەواوی میللەتی موسڵمان[١]، ئیتر ئەو ناوانە دووچاری سەر و گوێلاك شكاندن بوون و لە ناوە هاوتا عەرەبییەكانیان نزیك دەكرانەوە، گرینادا بووە (غرناطة).. ئامێدی بووە (عمادیة).. نو گرد كرایە (حديثة) دەیانگوت سنجار عەرەبییە لە (هذا سن جبل جار علينا) هاتووە[٢]، سامەڕاش لە (سر من رأي) هاتووە، لەسەر ئەو بنچینە لای توێژەری كورد ڕەگی تەعریب بۆ قوڵایی مێژوو و سەردەمی خەلافەتی ئیسلامی دەگێڕنەوە، جاریش وایە فەتحی كوردستان بە ئەنفالی یەكەم پۆڵێندەكەن، بەوەش خزمەتێكی بەخۆڕایی تەعریب و ئاڵۆزبوونی كێشەی ناوچە ناكۆكەكان دەكەن، ئەگەر ئەو ناوچە شانۆی تەعریب و تەماحی عەرەب بێت لە سەردەمی خەلافەتی ئیسلامی، ئەوا ئەو كێشەیە چارەسەر نابێت و ناشكری بلێی كوردستانیە، بەڵام ڕاستیەكەی وانیە، جاروایە پێچەوانەی ڕاست بووە، تەكرید هەبووە، هەروەك (تۆماس بوا) لە كتێبی (تأريخ الاكراد، ص ١٩٧) و ڕاپۆرتی لێژنەی (تحكيم الموصل، ص١٤٨) زۆر سەرچاوەی تر هاتووە: تورك و عەرەب و ڕەگەزەكانی ترهاتوونە لەناو كورد تواینەوە، لە ڕاپۆرتەكانی بەریتانیش ئەوە دەردەخا كە لە سەردەمی عوسمانیدا تورك لە ناو كورد تواینەوە[٣].

---

١. ایران تاریخ و الحضارة، ص٥٣.

٢. بۆ ئەم مەبەستە توێژینەوەی بەپێزی (وێنەی كورد لە زانینی مێژووی ئیسلامیدا) بخوێنەوە.

٣. تقرير المفتش العام الاول – ٣٧١/ FO. ١٢٢٥٥ .. و النصف الثاني هم الاتراك الذين حسب المصادر و الوثائق التاريخية المتوفرة فقدوا هويتهم القومية و تكردوا..

PDF 4 KURD

دەکرێ بڵێین تەعریب هەبووە، بەڵام بە مەبەستی (پاکتاوی ڕەگەزی) نەبووە، لە کۆتایدا سێ ڕەهەند زەمینەیەکی تەعریبی سازاندوە ئەگەر ئەو مەبەستەش نەبووبێ:

یەکەمیان هەوڵدراوە لە لایەن هەندێ فەقیهـ و مێژوونووس سەرجەلەی کورد (انساب الاكراد) بگێڕنەوە سەر عەرەب، لە کاتیکا ڕەچەڵەکی کورد ئاریە نەک سامی، مێژووی زۆر قووڵە ئیبن خەلدوون بۆ نزیک حەزرەتی نووح دەباتەوە و دەڵێ: (...وقال ابن سعيد كان آشوش أربعة من الولد: إيران و نبيط و جرموق و باسل. فمن إيران الفرس و الكرد و الخزر، و من نبيط النبط و السريان، و من جرموق الجرامقة و أهل الموصل، و من باسل الديلم و أهل الجبل)[1]..

دووەم هەندێ سوڵتان و دەسەڵاتدار ڕاگواستنیان کردوە دژ بە نەیارەکانیان لە قازانجی ئەوانەی لەگەڵیاندا بوونە، ئەو پرۆسەیەش بە هەر دوو دیو کوردی گرتۆتەوە، بۆیە هەندێ جار تەکرید دژ بەعەرەب و خەڵکی تر هەبووە هەندێ جاریش تەعریب، بە نموونە:هەریەکە لە ئیبن خەلدوون(١٤٠٦ز) و ئیبن ئەثیر(١١٦٠- ١٢٣٣ز) دەڵێن لە سەردەمی (خەلیفە موعتەسەم) کوردەکان دەستیان بەسەر موسڵدا داگرت، دوای بە زەحمەت شکاندنیان موعتەسەم بیری لەوە کردەوە کە خەڵکی عەرەبی لایەنگری خۆی بهێنیتە موسڵ، بەو شێوەیە یەکەم تەعریبی موسڵ لەو سەردەمی بووە، لە سەردەمی ئەمەویش زۆرخراپتر[2]..

---

١. تاريخ ابن خلدون، ج٢، ص١٠.

٢. لە (البداية و النهاية، ج١٦) باس لە بڕیارێکی جینۆساید دەکات لە سەردەمی ئەمەوی: ... و فيها استعمل الحجاج على فارس محمد بن القاسم الثقفي، و أمره بتقل الاكراد.

PDF 4 KURD

سـێیەم لـە فقهـی ئیمـامی شـافیعی و میراتگرانـی و فتواکـانی ئیـبن تـەیمیـەدا عـەرەب بەسـەر عەجـەم و کـورددا (فـەزڵ) کـراوە[١]، ئـەو

---

١. هەرچەندە دەقی ئاشکرا دژ بە(فەزڵ) هەیە لەسەر بنچینەی ڕەگەز و ڕەنگ و چینایەتی، کەچی لـە سـەردەمی ئەمـەوی بـاوی وەرگـرت و زانـای گەورەشـی تێـوەگلان، ئـەوەی عەرەب نەبووایە پێیان دەوت (موالی)، زۆر کتێب و سەرچاوەی تری گرنگ بە ڕوونی دەریدەخا کە (زۆربـەی) ئـەهلی سـوننە و جەماعـە پێیـان وایـە عـەرەب فـەزڵی بەسـەر عەجـەم هەیـە، لـە کتێبی(مسـبوک الـذهب فـي فضـل العرب)ـدا بـە فـەرموودە یاسـاغی هاوسەری نێوان عەرەب و عەجەم دەکا. لە مەزهەبی ئیمامی شـافعییش لـە بـابی زەواج بەشـی (کفـاءة) هـەمان ڕای هەیە،چەنـدین مەزهـەبی تـریش ئـەو دەردەیـان هەیـە. ئیـبن تەیمیە – لە (اقتضـاء الصـراط المسـتقیم، ج١، ص٤١٩) دەڵێ: (فإن الذی علیه أهل السـنة و الجماعة: اعتقاد أن جنس العرب أفضل من جنس العجـم، عبرانیهم و سـریانیهم، رومـیهم و فرسـیهم و غیـرهم) تـا ئـەو ڕادەیـە لـە کتێبـی (العروبـة بین الشـعوبیة و الاسـتعمار)ـدا هاتووە خودی ئیسـلام پێویسـتی بـە ئەخلاقی عـەرەب بـووە !! بـۆ زیـاتر لـە (المعرفـة و التاریخ – أبو یوسـف یعقـوب بـن سـفیان الفسـوي، المحقق: د أکـرم ضـیاء العمـري، ج٢، ص٦٣)دا هاتووە: تـزوج بـن سـیرین عربیـة وکـره المـوالي لمـا یـدخلهم مـن السـبي. قـال: فذهب بن عون یتشبه به فلم یحمل له العرب ذلک، فرفعوه إلی بلال بن أبـي برده بن أبـي موسی الاشـعري فضربه و فرق بینهما، قال له: طلقهـا. قـال: هـي طـالق. قـال: ثلاثـا..؟ قـال: واحدة تبتها. قال: أقول لـه ثلاثـا و هـو یبتهـا. وقـال لـه: طلقهـا. قـال: هـي طـالق ثلاثـا. قـال: واحدة. قال: أقول لـه ثلاثـا و هـو یفتیني بطلاقهـا. دەشـڵێن عـەرەب عـاقڵترن و کـورد و عەجـەم دەبـێ لـە خزمەتیانـدا بـن، زۆر لـە بنەماڵـە کوردەکـان بـەو هۆیـەوە خۆیـان بردۆتـەوە سـەر ڕەچەڵـەکی عـەرەب، بـەو شـێوە زۆربـەی میللـەتانی لاواز لـە شـام و سـەرووی ئـەفریقا لـە نێو عەرەبدا توانـەوە، لـەو بەڵگەنامە بەریتانیـەدا دەردەکـەوێ کـە کورد نەتواینەوە:

– CO 730/ 161/2 .... ینطق الکرد باللغة الکردیة التي تعـود الـی اللغـات الآریـة ولا تربطها شـيء بالعربیة ذات الأصل السامي. بینما استطاع العرب ان یفرضـوا لغـتهم علـی الشـعوب الغیـر العربیـة فـي سـوریا ومصـر ومنـاطق أخـری فلـم یسـتطیعوا ذلـک فـي کردستان حیث لا زال الکرد یتکلم بلغته الاصلیة...

PDF 4 KURD

فەزڵکردنەی عەرەب بەسەر عەجەم لە لایەن هەردوو مەزهەبی شیعە و سونە - ئەوەی شیعە ئەوەندە تۆخ نییە، بەڵام بەپێ بنچینە (اهل البیت) فەزڵدەکەن ئەوانیش هەر عەرەبن کاریگەری لە میللەتە لاوازەکان کرد و زۆربەی شام و فەلەستین و سەرووی ئەفریقا بەبێ فشاری دەسەڵات لە عەرەب توانەوە، کوردستان بەهۆی سەردەستەیی و بەرگەی بەهێزی نەتوایەوە تا لە کۆتایی سەدەی (١٩)دا بەرەبەرە لاوازکرا، بۆیە دەبینین لە دوای ئەو مێژووە بەرەبەرە کەرکووک و موسڵ ژمارەی دانیشتوانی کوردی لێ کەمدەبێتەوە، لە بەرامبەردا (بەتایبەتی لە ١٩٠٨) تورکمان زیاددەکا شانبەشانی زیادکردنی عەرەب، پێش ئەو بەروارە لە گەڕیدە و نەخشە و ئامارەکان بە ئاستەم باسێکی بوونی کەمی عەرەب و تورکمان کراوە، کەچی بۆیەکەم جار لە لایەن ئۆلیڤەر (١٨٠٩) لە سەردانەکەی بۆموسڵ دەڵێت: موسڵ (٢٥٠٠٠) عەرەب، (١٦٠٠٠) کورد، (١٦٠٠٠) تورکمان، (٨٠٠٠) مەسیحی، (١٠٠٠) یەهوودی لێیە[١]، دوای ئەوەی عێراق لە (١٩٢١) دروستکرا لە لایەن بەریتانیا، تەقەلای بەعەرەبکردنی ئەو ناوچانە دراوە، تەعریبی ڕاستەقینە لە سەرەتای سەدەی بیست دەستپێکرد و یەکەم جاریش بەریتانیا دەرگای کردەوە، لە ڕێککەوتنامەی سایکس- پیکۆی (١٩١٦) بۆ یەکەم جار ئەو ناوچانەی

---

١. تقریر ولایة موصل ص١٠٩، لە کتێبی (مشکلة موصل- ... ص٩٥) کوردی کردۆتە (١٧٠٠٠) و تورکمانی کردۆتە (١١٠٠٠). (بۆ ئاگاداری: ئەو ڕاپۆرتەی ویلایەتی موسڵ کە لەبەردەست ئێمەیە کەمێک لەگەڵ ئەسلیەکە لە لاپەڕەکان جیایە دەقەکەی ئەوەیە- ولایة الموصل تقریر لجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع الترکي البریطاني حول ولایة الموصل- مراجعة و تحقیق:عبدالرزاق محمود القیسي).

ناوینرا (B) و لە کوردستانیان جیاکردەوە، ئینجا حکومەتە عەرەبیەکانی بەغدا بە ناڕاستەوخۆ، ئەوە لە کەرکووکیش بەڕوونی بەدیدەکرێ لە بەڵگەنامەیەکی بەریتانی ساڵی (١٩٣٨) وا بەدیدەکرێ کە کورد بۆ یەکەم جار لەسەر ئاستی میللی هەست بە تەعریبی کەرکوک و تەقەلای سامان بردنی کورد بکەن. لەو بەڵگەنامەیە (fo.370/671,secret-ref.c/s/3 سليمانية- ١٩٣٨/٤/٦) مۆری (ولْسون)ی پێوەیە دەڵێت لەناو خەڵک دروشمی (نەوتی کەرکووک موڵکی کوردە) بڵاوبوویتەوە، هەروەها دەڵێن (لا الجمل حيوان و لا العرب إنسان)... واتە قین لە عەرەبیش دروستبووە کە پێشووتر عەرەب لەناو کورد زۆر خۆشەویست بووە، واتە تەعریب هەستپێکراوە لەسەر ئاستی میللیش، ئیتر دوای ئەوانەش لە هەر ئامارێک بۆ ئامارێکی تر ژمارەی کورد کەم دەکا هەربە نموونە: لە نێوان هەردووئاماری (١٩٥٧ و ١٩٧٧)دا عەرەب لە (٢٨,%)ەوە بەرز بۆوە بۆ (٤٤,٤ %) هەرچی کوردە ڕێژەی کەمبۆوە لە (٤٨,٣ %)ەوە بۆ (٣٧,٦ %)، یەکەم بەڵگەنامەی فەرمی کە ئاماژە بە تەقەلای تەعریبی شاری کەرکووک و دەوروبەری دەدا دوای ساڵێک لە ئینقلابی (١٩٥٨) لە لایەن (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)، نووسراوی (ژ:س/١٤٢) لە سەرکردایەتی (فق٢ – استخبارات) لە (١٩٥٩/١/١٩) بۆ سەرۆکی ئەرکان دەنێرن بەناوی (الحالة السياسة في المنطقة المسؤولية فق٢) دەڵێن: "سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاریداوە دوو ئەفسەری بەهێز بۆ کەرکووک بهێنی (عبدالجليل الحديثي محافظ الكركوك و ناظم طبقجي قائدا للفرقة) چونکە ئەو ناوچەیە زیاتر کوردن"، لەسەر دەستی حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق، تا گەیشتە



PDF 4 KURD

(١٩٦٣)ـی ئینقلابی بەعس توند بوو، دوای نەمانی بەعس هێور بۆوە، دوای (١٩٦٨) تەعریب بووە فەرمی، ئەوەش قۆناغێکی تری ترسناکی تەعریبە [هەمان پرۆژەی (ارض بلا شعب لشعب بلا ارض) کە لە کۆنگرەی لەندەنی (١٨٤٠) درایە "بالمرستۆن"ـی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا)] دژ بەکورد پەیڕەو کرا، بۆ ئەو مەبەستە لایەک لە نامەیەکی جەمال عبدولناسر بۆ کەنەدی سەرۆکی ئەمریکا بڵاودەکەینەوە سەبارەت بە (بەیەهوودیکرنی فەڵەستین) زۆر وێچووی تەعریبی کوردستانە، لە نامەکەدا هاتووە: [قد اعطى من لا یملک وعدا لمن لایستحق، ثم استطاع اثنان (من لایملک) و (من لایستحق) بالقوة و الخدیعة أن یسلبا صاحب الحق الشرعي حقه فیما یملکه و فیما یستحقه][١]، ئەوە پەیڕەوکرا دژ بە کورد لە کەرکووک لە لایەن برای عەرەبی خۆی و لە عێراقێک گوایە هەردوو لایەن هاوڵاتی و شەریکن. بەم شێوەیە لەوەتەی خراوەتەوە سەر عێراق خێری لێ نەبینیوە، کوردستان بچووکبۆتەوە، دەسەڵاتدارانی عێراق ئامادەبوونە خاکی عێراق بدۆڕێنن لەپێناو بچووککردنەوە کوردستان، وەک لە ڕێککەوتنامەی جەزائیری (١٩٧٥) بینیمان لەنێوان ئێران و عێراق.. چۆن عێراق لەپێناو گورز وەشاندن لە شۆڕشی کوردستان لایەک لە خاک و ئاوی عێراقی دا بە ئێران. ئەو تەعریبە بووە هۆی گۆڕینی نەخشەی دیمۆگرافی ناوچەکە و جێگیر نەبوونەوەی تا ئەو ساتەش، ئینجا ناوی ناوچە و شار و گوندەکانیشی لە کوردیەوە کردە عەرەبی، لە هەمووان ترسناکتر بە

---

١. فلسطین في الرسائل عبدالناصر و کندي، ص٢٢.

PDF 4 KURD

بڕیاری (مجلس قیادة الثورة) بە (ژ:٤١) لە (٢٩/ کانونی دووەم/١٩٧٦) ناوی کەرکووکیشی کردە تەئمیم[١]، لە پاشان دەوڵەت خۆی بە تەعریب هەستاوە بەو شێوەیەی خوارەوە:

١. المرسوم الجمهوري- بە مۆری ئەحمەد حەسەن بەکر (ژ:٦٠٨ - ١٩٧٥/١٢/١٥) هەردوو شارۆچکەی چەمچەماڵ و کەلاری لە کەرکووک دارنی و خستیە سەر سلێمانی.

٢. المرسوم الجمهوري - بە مۆری ئەحمەد حەسەن بەکر (ژ:٣٣ - ١٩٧٦/١/٢٥) تێیدا کۆمەڵێک گۆڕانکاری ئیداری و ڕەگەزی لە کەندیناوە و قەراج دەکات، هەروەها بە پێی بڕیاری (ژ:٥٥/ محافظة التأميم - ١٩٧٦/٣/٢) ناوی گوند و شارۆچکەکانی ئەو ناوچەیە بگۆڕدرێت لە کوردی بۆ عەرەبی، لەوانە: زندانە بۆ (النصر)، یارمچە بۆ (جدة)، تۆغماغلو بۆ (الخنساء)...هتد، ئەو کاتی شۆڕشی کوردیش نەمابوو تا بڵێین ئەوە بە هۆی نا ئارامی بوو.

٣. مجلس قيادة الثورة - بە مۆری ئەحمەد حەسەن بەکر- (رقم القرار:١٦٠-١٩٨٧/٣/٢٩) دەسەڵاتەکانی (شمال العراق) بە هەردوو دەزگای تەشریعی و تەنفیزی کۆکردەوە و خستیە بەر دەست ئەندامێی قیادەی قوتری (قطري).

٤. سەبارەت بە گۆرینی ناسنامەی نەتەوەیی (مجلس قيادة الثورة - رقم: ١٩٩- ٦/٩/ ٢٠٠١) ئەوەی لەسەر خاکی عەرەب دەژی بە عەرەب هەژماردەکرێت بۆیە ئەو دۆخە نەریتیاوەی کە لە سەردەمی عوسمانی بۆ عەرەب بە سلبی ماوەتەوە چابکرێت، بەو پێیە لە بڕیارێکی تریان بە

---

١. ئەو بڕیارە لە (١٩٦٩) دەرچووبوو بەڵام ئەو کاتە باری جێبەجێکردنی لەبار نەبوو.

PDF 4 KURD

(ژ:٢١/٣٤) کـە پێشـووتر لـە (١٩٩٨/٤/٥) دەرچووبـوو جێبـەجێ بکرێـت: هەرکوردێک یان کەمینەیـەکی تری نەتـەوەیی خۆیان بۆ عـەرەب گۆڕی ئـەوا هـەموو مافـەکانی دەگەڕێتـەوە لـەو شـارە وەک عـەرەب، ئـەوەی ناسنامەشی ڕاست نەکردەوە ئەوا یەکسـەر دەگوازرێتەوە بۆ شـارەکانی خواروو. ئەوە لە کاتێکا بڕیارێکی تر دەرچوو لـە (مجلس قيادة الثورة-بـە مـۆری سـەدام حوسـێن (ژ:٨٥٠ - ١٩٨٨/١١/٢٧)ـدا (٤) ماددەیـە، لـە یەکەمدا دەڵێت: بە هیچ جۆرێک نـابێ عـەرەب ناسـنامەی نەتەوەیـەی بۆ نەتەوەوڕەگـەزێکی تـر بگۆڕی و هـیچ پاسـاو هۆیـەک وەرنـاگیرێ، بـەلای کەمیساڵێک زیندانی دەکری.

٥. مجلـس قيـادة الثـورة (ژ:١٦٠-٣/٢٩/ ١٩٨٧) بـە بڕیـاری هـەردوو (القيادة القطرية و القومية) عەلی حەسەن مەجید بکرێتە حـاکمی موتڵـەقی کوردستان بە هـەموو دەزگا حزبی و ئیداری و سیاسـی و سـەربازی و ئەمنیەوە، بە هەردوو دەزگای تەشریعی و تەنفیزی کوردستانیشەوە[١].

٦. پلانێکـی تـەعریب بـە فـەرمی دارژێـرا لـە (١٩٩٣/٤/٥) بـە پێـی بڕیـاری (ژ:٨٧/١١/٣) بـەناوی (لجنة الشمال) پێکهاتبوو لـە: (مزبـان خضـر هـادی، نـوري فيصل شاهر، خضر عبدالعزيز الدوري، مزهر العواد، وزير الداخلية، مدير جهاز المخـابرات، مـدير الامـن العـام، مـدير اسـتخبارات العسـكرية) هـەموو ئەوانـە بـە سـەرۆکایەتی تـەها یاسین ڕەمـەزان، (٥) مـاددەی تیـادا هـاتووە، یەکـەم داکۆکی ڕەها لە عروبەی کەرکووک بەهۆی پڕکردنی لە عەرەب دەکا.

---

١. ئەو هەنگاوە ویچووی بڕیاری (هیتلەر) بوو، کاتێ لە گەرمەی بەرگری میللەتانی ژێردەستە لە ساڵی (١٩٤٣) ڕاینهارت هیدریچ سـەرۆکی (جسـتاپۆ-هـەوالگری) دەسـتووری موتڵـەقی پێدا بـۆ پاکتـاوی ڕەگـەزی هـەرێمی (باڤاریـا) و لێدانی شۆڕشگێران، ناوی بە (جەلاد) ڕۆیشت.

PDF 4 KURD

٧. (مجلس قيادة الثورة – رقم:٦٣٢- ١٩٨٩/١٠/٧) بە مۆری سەدام حوسێن تێیدا هاتووە کە قوتابی بە هۆی زمانی کوردی ناکەوێ.

٨. (أمر وزير الداخلية - ژ:١٠٤٧٢-١٩٩٣/٩/١٩) مانەوەی تورکمان لە کەرکووک و کۆمپانیای نەوت.

٩. بە ڕاستی مانای تەعریب لەو بڕیارە وەردەگری، چونکە ڕەنگە ئەوانی تر ناوی وەک (تەعریق) هەڵگری.. تەها یاسین ڕەمەزان (ژ:٨٥/٢٠-١٩٩٧/١/٢٠) بڕیارماندا لە جێی کوردەکان میسریەکان دامەزرێنین..

١٠. تەنانەت ئەو ڕەگەزپەرستیە دژ بەوانەش بوو کە لەگەڵ خۆیان بووە، ئەو عەشیرەت و سەرۆکانەی جاش و خزمەتکاریشیان بووینە، بڕوانە ئەو نووسراوە: [حزب البعث العربي الإشتراكي- ق ف التاميم (ژ:١٧٧٨/٢)] و نووسراوێکی تر بە (ژ:٩١٨٧/٢٩ - ١٩٩٨/١٢/٧) دەرچووە تێیدا بە توندی قەدەغەی بوونی هەرکی و زێباری لە ناوچەکانی پردێ و مەخموور و ئەو ناوچانەدا دەکا، داوا لە عەرەبەکان دەکا زەوی بەوانە نەدەن، لە نووسراوێکی تری سەیر کە بە (ژ:١٣٠٥/٢٩ - ١٩٨٨/٨/٢٩) دەرچووە فەرماندەدا بە سزای ئەو خانەوادە تورکمانیانەی کە خزاونەتە (افواج الخفيفة/ جاش) و دەربکرێن وەک کورد.

١١. بەڵگەی لە هەموان بەڵگەتر خودی حکومەتی عێراق دانی بە بوونی تەعریبدا ناوە: لە برگەی (ب)ی ماددەی (٥٨)ی (قانون إدارة الدولة الإنتقالية -٢٠٠٤ز) دان بە بوونی پرۆسەی تەعریب و دەستکاریی سنووری ئیداری دەنێ دژ بە کوردستان لەو ناوچەیە کراوە، لە سەردەمی حکومەتی بەعسیش دان بە تەعریب هێنراوە دژ بەکورد لە خاڵی(٨)ی ڕێککەوتنامەی (١١)ی ئاداری (١٩٧٠): "إعادة سكان القرى العربية و الكردية الى اماكنهم السابقة.." ئەوە لە هەموو بەڵگان بەڵگە ترە کە ڕەوایی پێدەدا.

### پاساوی عروبیەکان[١]

لە ڕاستیدا پاساوی بەرامبەر زۆر لاوازە، تا ئێستا بوێری ناکەن بڵێن ئەو ناوچەیە سەر بە عەرەبستانە، یاخود هەرێمێکی عەرەبی بۆ ببیننەوە، تەنها تەقەلایان ئەوەیە بڵێین کوردستانی نییە، باشترین بەڵگەی عەرەبی نەبوونی ئەو ناوچەیە خودی تەعریبە، کە دژ بە هەموو ڕێساو یاسایەکی مرۆیی و ئاینیە، بۆیە ئەو کارە تایبەتە بە عەرەبی شۆڤینی نەک هەموو عەرەب، سەرجەم پاساوەکانیان ئەو چەند خاڵەیە:

١. دەڵێن: ئەو ناوچانە عێراقین.

٢. هەندێکیشیان ڕاوی بەڵگەنامەی مێژوویيان کردوە، هەندێ بەڵگەیان دەستگیربووە، لەوانە:

أ/ دەڵێن لە سەردەمی عەباسی ئەو ناوچانە سەر بەغدا بووە. بەڵگەی بەریتانیا لە کێشەی ویلایەتی موسڵ خودی تاپۆی عوسمانی (دائرة التسجيل العقاري) کە لە (١٦/تشرین یەکەم/١٩٠٨) دەرچووە دەردەکەوێ شارەزووریش سەر بە عێراق بووە.

ب/ لە ڕێککەوتنی شەریف حوسین بن عەلی لەگەڵ ماکماهۆنی بەریتانی بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی عەرەبی گەورە لە (١٩١٥)، ئەوا ئەو ناوچانە تا ئامێدی و دیاربەکر و نسیبین و هێڵی (٣٩)ی تێدا بووە.

ج/ لە سەردەمی عوسمانییش هەندێ جار ویلایەتی موسڵ سەر بە بەغدا بووە.

---

١. مەبەستمان لە عروبی ئەوانەی زیاد لە پێویست ناسیۆناڵیزمن بەرامبەر میللەتانی برایان، کە ئەو هەستەیان بەرامبەر دوژمنە ڕاستەقینەکانیان نیە، ئینجا دان بەوە نانێن کە تەعریب ڕوویداوە. بۆ جیا کردنەوە لە میللەتی عەرەب ئەو زاراوەمان بەکارهێناوە.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

د/ هەندێ جار باس لەوەش دەکەن کە نەک ئەو ناوچانە، تەواوی ویلایەتی موسڵ لە کێشەکەی نێوان تورکیا و عێراق پاساییانە بە عێراق درا، ئیتر ئەو ناوچانەش بەشێکە لە ویلایەتی موسڵ و عێراقین.

بەشێکی تر پاگەندەی ئەوە دەکەن کە لە سەردەمی مەدحەت پاشا ویلایەتی موسڵ خرایە سەر بەغدا و ئیتر موڵکیەتی بەغدا بەسەر ئەو ناوچەیە پاساییە.

هـ لەگەڵ زۆر پاساوی لاوازتر، لەوانە دەڵێن خۆ کەرکووک شارێکی کوردی نییە، زیاتر تورکمانی لێیە، عەرەب و ئاشووری و کەمینەی تریشی لێیە، ئاواش باقی ناوچە ناکۆکەکان. دەڵێن ئەوەتا لە ئاماری (١٩٥٧)دا کورد (١/ ٣)ی دانیشتوانی کەرکووک پێکدەهێنێ.

**کورتە هەڵسەنگاندنێکی ئەو پاساوانە:**

مەبەست لە هەڵسەنگاندن وەڵامدانەوە نییە، چونکە ئەو نووسینە خۆی لە خۆیدا وەڵامە، نابێ توێژەری بە ویژدان دەمارگیری هەبێ، دەبێ داکۆکی لە هەرچی ڕاستە بکا، ئەگەر ئەو ناوچەیە کوردستانی نەبێ و خاوەنی تری هەبێ ئەوا نابێ چاو لە مافی خەڵکی تر بێ لەسەر ئەو بنچینە قووڵ و ویژدانیە هەڵسەنگاندن دەکەین.

**<u>١. پاساوی عێراقیبوونی ئەو ناوچەیە:</u>**

ئەو پاساوە دوو بەشە، ئەگەر مەبەست لەوە بێت کە ئێستا ئەو ناوچەیە عێراقیە، کەس نکوڵی لەوە ناکا لە دوای ساڵی (١٩٢٠)ەوە یان وردتر لە دوای ساڵی (١٩٢٥) چۆن هەولێر و سلێمانی و ناوچەی قەندیل عێراقیە ئاواش ئەو ناوچە دابڕاوانە عێراقین، بەڵام ئەگەر مەبەستی

PDF 4 KURD

مێژوویی بێت واتە پێش ساڵی (١٩٢٠) ئەو ناوچەیە عێراقی بێت ئەوا هیچ بنەمایەکی نییە، نەک ئەو ناوچەیە بەڵکو سەر بە ویلایەتی بەغداش نەبووە، ئینجا عێراقی عەرەبی نەگەیشتۆتە بەغداش، چ جای ئەو ناوچەیە، ئەو بابەتە دوای زیاتر بە بەڵگەنامە باسی دەکەین، چونکە ئەوانەی دەڵێن عێراقیە، مەبەستیان برگەی یەکەمە زیاتر نەک دووەم، ئەوەش لە ڕووی یاسایی و سیاسی چارەکراوە بە بوونی دوومیللەت و دوو هەرێم لە عێراق لە سەرەتای دروستبوونی عێراقدا تا ئەو ساتە، بەڵام پێشێلکراوە، ئەگینا زۆر هەنگاو هەبووە و هەیە کە بریتین لە:

أ- بەریتانیا بە ناچاری دوای شەڕێکی زۆر لە ساڵی (١٩١٩) وەک حوکمدار دەسەڵاتی کوردی بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموودی ناساندووە.

ب- ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ و مەرجەکانی لکاندنی خوارووی کوردستان بە عێراق کە بریتی بوو لە (٢٥) ساڵی تر ئینتداب و پێدانی مافی چارەنووس بە کورد لەو شوێنانەی زۆرینەن.

پ- لە بەیانە دوو قۆڵیەکەی بەریتانی عێراقی لە (٢٨ /تشرینی دووەم/١٩٢٢)دا دیسان دان بەو مافە نرا.

ت- دوای (عصبة الأمم) لە وەڵامی سکاڵای کۆمەڵێک سەرکردەی کورد لە ڕێنماییەکی تایبەتی بۆ بەریتانیای دەوڵەتی (ئینتداب) نارد کە بریتی بوو لە (٣) ماددە تێیدا لە ماددەی دووەم داواکرابوو حکومەتێک بۆ کورد پێک بهێنرێت و چیتر بە هەڵە لێکدانەوە بۆ بڕیاری ڕۆژی (١٩٢٥/١٠/١٦) نەکرێ[1].

---

١. دەقی بڕیارەکەی (عصبة الأمم) لە (المشكلة الكردية في الشرق الأوسط، بخوێنەوە. مەبەست لە بڕیاری ڕۆژی (١٩٢٥/١٠/١٦) ئەو بڕیارەیە کە ویلایەتی موسڵ خرایە سەر عێراق بە پێی لێژنەکەی عوسبە.

PDF 4 KURD

ج- لە کۆنگرەی قاهیرەی (١٩٢١) دان بە بوونی هەرێمی کوردستان نراوە و لیژنەیەکی بۆ پێکهات..

چ- ماددەی (١٦)ی لائیحەی ئینتدابی بەریتانی دووبارە داکۆکی لە داننان بە حکومەت و هەرێمی کوردستان دەکاتەوە، ئەو لائیحەیە پێکهاتبوو لە (٢٠) مادە، لە لایەن خۆشیەوە لائیحەی ئینتدابیش پاڵپشتیکردبووە سەر بڕگە (٤)ی ماددەی (٢٢)ی کۆمەڵەی گەلان.

ح- ماددەی (٤)ی دەستووری (١٩٢٥) کە یەکەم دەستووری عێراق بوو بە (یاسای بنەڕەتی) نێوزەد دەکرا تێیدا ئاڵای عێراق بە (٢) ئەستێرە دەستنیشانکرا[1] بۆ ئەوەی گوزارشت لە عێراق بکات کە لە دوو نەتەوە و دوو هەرێم پێکهاتووە[2]، پێشووتر ئاڵای عێراق یەک ئەستێرەی لەسەر بوو بۆ ماوەی ساڵێک وەک لە نامەی (میس بیل) ڕۆژی (١٩٢١/٨/٢٨) ڕوونتر دەردەکەوێ[3]، لەو سەردەمی تا ئێستاش ژمارەی ئەستێرە زیاتر گوزارشت لە ژمارەی ویلایەت و هەرێم دەکرد، هەروەک ئێستاش ژمارەی ئەستێرەکانی ئاڵای ئەمریکا ئەو گوزارشتە دەکات.

خ- دەستووری (١٩٥٨) لە ماددەی ٣ دووبارە داکۆکی کردەوە لە هاوبەشی هەردوو گەلی کورد و عەرەبە.

د- جگە لە هەریەکە لە بەیانی (٢٩)ی حوزەیران و ڕێککەوتنامەی (١١ی ئاداری ١٩٧٠) یاسای ئۆتۆنۆمی (١٩٧٤) و هەردوو دەستووری ئینتقالی و هەمیشەییەکەی ئێستا، لەگەڵ هەموو ئەو بڕیارانەی بە

---

١. بڕوانە: دەقی دەستووری عێراق ١٩٢٥ پێکهاتبوو لە (١٠باب) و (١٢٣) ماددە.

٢. بڕوانە: الإسلام و العلمانية.. ص٢١٠.

٣. بڕوانە: مس بيل – العراق في الرسائل مس بيل، ص٣٤٦.

PDF 4 KURD

پێی بەندی حەوتەم دەرچوو لە نەتەوە یەکگرتوەکان، لە هەموی گرنگتر بۆ ئەو بەشە بڕیاری (٩٨٦) کە ڕێژەی (١٣%) تایبەت لە خۆراک بۆ کوردستان دیاریکرا.

.. هەموو ئەوانە لەسەر بنچینەی عێراقێکی پێکهاتوو لە دوو نیشتمان و هەرێم و شێوەی فەرمی وەرگرتوە بە تایبەتی برگەی (د)ی ماددەی(١)ی (قانون الحكم الذاتي لمنطقة كوردستان-١٩٧٤) مانای عێراقی بە هەمووان داوە، ئیتر ئەو جۆرە جەدەلە یاسایی نییە، کەواتە ئینتمای شار و شارۆچکە و دەڤەر بۆ هەرێمێکی وڵات یاساییە لە چوارچێوەی عێراق.

## ٢. پاساوە مێژووییەکانیان:

أ/ سەردەمی عەباسی: گوایە لەو سەردەمە ئەو ناوچانە سەر بە عێراق بوونە، بەهۆی بەغدا.. لە ڕاستیدا وا نییە لە سەردەمی عەباسی بەغدا پایەتەختی عێراق نەبووە، بەڵکو پایەتەختی عەباسی بووە، ئەگەر ئەوە پاساو بێت، ئەوا ئەنادۆڵ و شام و لبنان و ئیسرائیل و میسر و... هەمووی عێراق بووە، ئەوکات ویلایەتی عێراق هەبووە، بەڵام دواسنووری کەمێک سەرووی سامەڕا بوو، ئەوکات ئەو ناوچانەی کەرکووک و موسڵ سەر بە هەرێمی جزیرە و ویلایەتی شارەزوور بوون.

ب/ کە دەڵێن لە ڕێککەوتنی (شەریف- ماکماهۆن) لە کتێبی (دور ملك فيصل..ص١٤) هاتووە: (ان ولاية موصل الى ماردين و كوردستان جنوبية ضمن إتفاق ماكماهون - شريف)، ڕاستی ڕێککەوتنامەکەی شەریف – ماکماهۆن لە هەردوو کتێبی:(الملل و النحل و الاعراق، ص٢٢٦) و (فورستر- نشأة الدولة العراقية، ص٧٢) هاتووە کە ئەوەی

PDF 4 KURD

بەڵێن بە شریف دراوە لە (١٩١٥) ڕاستیەکەی وانییە، چونکە دوای ئەو ڕێککەوتنە بە ساڵێک دابەشی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست کرابە پێی سایکس پیکۆ، تێیدا سنووری عێراق تا کەمێک سەرووی بەغدایە، ویلایەتی موسڵ درا فەرەنسا کە لایەک نەبووە لە ڕێککەوتنامەکەی شریف ماکماهون، خۆ ئەگەر لەو ڕێککەوتنەش بدرایەتە عەرەب، نە یاسایی بوو نە شەرعی، چونکە ئەو ڕێککەوتنە نێودەوڵەتی نەبووە، ئەو دوو لایەش لە ڕێککەوتنەکە لایەنی ڕەسمی و یاسایی نەبووە، بە نهێنی و جەنتڵمانی ڕێککەوتنێکیان کردوە و تا ئێستا بەندەکانی دیارنییە.

سەرەڕای ئەوەش پێدانی ئەو ناوچانە لە ڕێککەوتنەکە نەبووە، ڕاستی ئەو پرسە بەو شێوەیەی خوارەوەیە:

دوای ئەوەی هەردوو حزب (حزبی فەتاتی عەرەبی و حزبی عەهد) بەو ڕێککەوتنەی نێوان شەریف و ماکماهۆنیان زانی، لە (١٩٢٠/٣/٨) کۆبوونەوەیەکیان لە دیمەشق کرد، پرۆژەیەکیان بۆ شەریفی مەککە (باوکی مەلیک فەیسەڵ) نووسی، تێیدا پێشنیاریانکردبوو ئەو حکومەتە عەرەبیەی دایدەمەزێنێت لە مارسینیا و ئەدەنەوە تا هێڵی (٣٩) و جەزیرە و ئامێدی و دیاربەکریش بگرێتەوە، شەریفیش ببێتە خەلیفەی موسڵمانان. ئەو پرۆژەیە بە (میساقی دیمەشق) ناوزەددەکری، بەڵام ماکماهۆن ئەو پرۆژەی قەبوڵ نەکرد، وەک (براترام تۆماس) سنووری ئەو ڕێککەوتنەی ئاشکرا کردوە و دەڵێ لە لای سەروو ڕۆژهەڵاتی سوریا و خوارووی عێراق[١]، هەر ئەوەش بەرجەستە بوو لە سایکس

---

١. فورستر- نشأة العراق الحديث، ص٧٢ لە (تاريخ الإسلامي) و (الملل و النحل و الأعراق) بە هەمان شێوە ئەو سنوورەی (تۆماس)یان دیاریکردوە لەو ڕێکەوتنەکە.

PDF 4 KURD

پیکۆ.. ئەوە کەی دەبێتە بەڵگە و پاساو بۆ ئەوەی بڵێن کەرکووک عەرەبیە نەک لە ڕووی یاسایی هەتا لە ڕووی عەشایەریش نابێت.

پ/ کە دەڵێن ئەو ناوچانە بەشێک بوون لە ویلایەتی موسڵ کە لە ساڵی (١٩٢٥) (عوسبە) بە عێراقی دا.. ئەگەر ئەوە پاساو بێت ئەوا وەک خاڵی یەکەم هەر ئەوەیە هەموو کوردستانی باشووری ئێستا لەو کێشەیەی ویلایەتی موسڵ بووە، ئینجا ئەو لیژنەیە بڕیاریدا کە ئەو ناوچەیە کوردستانیە و لەو ناوچەیە ناوی عێراقیان هەر نەبیستبوو بە پێی ڕاپۆرتی لیژنەکە ڕۆژێک لە ڕۆژان سنووری عێراقی عەرەبی نەگەیشتۆتە ئەو ناوچەیە، سەرەڕای ئەوەش هەموو لایەک دەزانی ئەگەر بەریتانیا نەبووایە ئەو ویلایەتە لەژێر دەستی تورکیا دەبوو.

ج/ کە دەڵێن لە سەردەمی ویلایەتی موسڵ بەو بەشەشیەوە خرایە سەر بەغدا، ئەگەر واشبێت وەک برگەی (ج) گرنگیەکی یاسایی و سیاسی نییە، سەرەڕای ئەوەش وەک لە (پرۆگرامی خوێندنی باڵای عێراق) هاتووە مەدحەت پاشا والی عێراق بووە، ئەوە هەڵەی زانستیە، بەڵکو تەنها والی ولایەتی بەغدا بووە کە پێکهاتبوو لە (١١) قەزا، ئەوەش سنووری ئیداری ویلایەتی بەغدا بووە: کازمیە، عەزیزیە، عانە، دلێم، کووت، جەزیرە (مەبەستی ئەو جەزیرەی ڕۆژهەڵاتی سامرایە)، مەندەلی، خانەقین، بەدرە، جەسان، سامەڕا... ئەوەش هەمان سنووری سەرووی ویلایەتی عێراق بووە لە سەردەمی عەباسی، ئەگەر لەو سەردەمی ویلایەتی موسڵ خرابێتە سەر بەغدا بە پاساوی عەرەبیبوونی ناوچەیەکە بێت، ئەوا جاریش وابووە بەغدا خراوەتە سەر ویلایەتی موسڵ، یاخود جار وابووە ویلایەتی بەغدا

PDF 4 KURD

خراوەتە سەر کوردستان (وەک لە سەردەمی عەبدولڕەحمان بابان) دەبێ بڵێی بەغدا و دەوروبەری کوردستانین؟.

ت/ کە دەڵێن خۆ کەرکووک شارێکی کوردی نییە.. بۆیە عێراقیە، لە ڕاستیدا بە دەگمەن شارو وڵاتێک دەبینی بتوانرێ ناسنامەی ڕەگەزێکی دیاریکراوی پێ بدرێ، لەو ڕووەوە کورد زیرەک بووە لە گەڵاڵەکردن و چارەسەرکردنی ئەو خاڵە نەیان گوتووە کەرکووک و ناوچە ناکۆکەکان کوردین، بەڵکو گوتوویانە کوردستانیە، کاتی خۆشی کە گوتراوە موسڵ کوردستانیە یان کەرکووک نەگوتراوە کوردیە هەروەک لە (قاموس الاعلام)ی عوسمانی لە (ماددەی ویلایەتی موسڵ) وا هاتووە: خەڵکەکەی زۆری عەرەبن بەڵام هەرێمەکە پارچەیەکە لە کوردستان.

خۆ هەولێر و دهۆک و زۆربەی شارەکانی کوردستانی و بەغدا و موسڵ و زۆربەی شارەکانی عێراق پێکهاتوون لە ڕەگەز و تایفەی جیاجیا، تەنانەت لە بەغدا یەهوودی ئەوەندە زۆر بوو پشوو ببووە شەممە، ئەو حاڵەتە ناسنامەی نیشتمانی لێ ناکوژێتەوە، بوونی تورکمان لە کەرکووک و ناوچە دابڕاوەکان دەکەینە بڕگەیەکی سەربەخۆ.

لە ئاماری (١٩٥٧)یش (سەرەڕای تەعریب) کەچی ئەوە ئامارەکەیە: کورد (٣ر٤٨%)، (٢ر٢٨%)یش عەرەب، (٥ر٢١%)یش تورکمان، نەک ئەوەی برایانی عەرەب دەڵێن کورد زۆرینە نەبووە و بە (١٣) یان لە قەڵەم داوە.

ج/ بوونی تورکمان و ئاشووری و عەرەب لەو ناوچەیە حاشا هەڵنەگرە، زیاتر لەوەش لە تەواوی ئەو ناوچەیەی ئێستا پێی دەگوترێ عێراق

PDF 4 KURD

تورکمانی لێ بووه، بەڵام ئەو سیاسەتە شۆڤێنی و بەدەوی وایکرد ئەوانە تەواو کەم ببنەوە، تەنها لە ناوچەکانی کوردستان ماونەتەوە، ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ و بەڵگەنامەکانی بەریتانی و زۆر بەڵگەنامەی نێودەوڵەتی ئەو دووپاتی ڕاستیە دەکەنەوە.

مێژووی تورکمان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سوپایەی عەباسیەکان هێنایان لە لای چین و تۆران، دوای لەگەڵ شەپۆلەکانی مەغۆل و سەلجوق و سەفەوی بە مەڕ و ماڵاتەوە دەهاتن، لە لای فارسیش یەکەم جار نادر شا لە نێوان (١٧٣٣-١٧٤٣)دا قزلباشی (جەمەدانە سوورەکان) بەسەر کوردستان وەرکرد، کەواتە ماوەیەکی دووروودرێژە هاتوونە کوردستان بەلای کەمەوە (٥) سەدە دەبێت، ئیتر ئەوانە مافی تەواویان هەیە لەو وڵاتە، نابێ بە چاوی نامۆ و (موالی) سەیریان بکرێت، ڕایەکی چەوت و شۆڤێنیانە لە لایەن هەندێ کورد هەیە و هەبووە، دەڵێن تورکمان ئەو کوردانە بووینە کە پیاوی تورک بوونە لە سەردەمی عوسمانی، گوایە ناوەکەشی لەوە هاتووە[١]، نەخێر تورکمان و تورک و قیرگیز و ئۆزبەک و تاجیک و ئازەر.. لقەکانی تۆرانین کە لە بنەچەدا بە زمانی (توکی یو) قسەیان کردوە، تورکمانی کوردستان ئەوەندە پەیوەندیشیان لەگەڵ عوسمانی باش نەبوو، لە شەڕەکانی سەفەوی و عوسمانی ئەوان لای سەفەوی بوون (جگە لە تەلەعفەر)، پەیوەندی عوسمانی بە ڕەگەزی تورک بە هێز نەبووە ئەگەر لاوازیش نەبووبی، ئەوە لە دەستووری عوسمانی (مەشروتیە) ڕەنگی دابۆوە، لە ماددەی (٧١)ی هاتبوو: کە

---

١. لە بنەچەدا ئەو ڕایە بۆ مێجەرسۆن بە هەڵە دروستبوو لە ساڵی (١٩٠٨) وایزانی (تورک+مان) واتە پیاوی تورک.

PDF 4 KURD

ئەندامانی پەرلەمان (مەبعوسان/مبعوثين) نوێنەرایەتی ویلایەتێک و چینێک و ڕەگەزێک ناکەن، کەواتە ئەو ناوچانەی لە کوردستان ناوی تورکیان لێیە وەک قەرەداخ، قەرەچووخ، قوشتەپە.... ئەوە تورکاندنی ناوی کوردی نەبووە لە سەردەمی عوسمانی[1]، بەڵکو ئەوە زیاتر مەڕدارەکانی تورک بووینە ئەو ناوانەیان لەو ناوچانە ناوە، کاریگەری عوسمانی بەسەر تورکمانی کوردستان دوای ئینقلابە ڕەگەزپەرستیەکەی ١٩٠٨ی ئیتحادوتەرەقی دەستپێدەکا، هەر یەکەم پرۆسەی تورکاندنیش بە پێی (تۆما بوا) لە کتێبی (تاريخ الاكراد) لەسەر دەستی (ئەنوەر پاشا) دەستپێکرد، بە پێی نووسراوی فەرمی و مەرکەزی کەمێک پاش ئەو یەکەم پرۆسەی تورکاندن لە لایەن ئیتحادو تەرەقی کراوە، لە سەردەمی ئەتاتورکیش لە ساڵی (١٩٢٣) بە پێی بڕیاری حکومی (ژ:١٥٠٥) زەویەکانی شێخ و سەرۆکەکان سەنرانەوە بۆ موهاجیرە تورکەکان[2].

ئیتر لە دوای ئەو بەرواره (واتە لە کۆتایی سەدەی ١٩) گەلێ جار لە لایەن گەڕیدە و ئینسکلۆپیدیا و ئاماری تری نافەرمی ناوی تورکمان شان بە شانی کورد هاتووە لە کەرکووک، هەندێ جار زیاتریش، ئەوە لە ڕووی ئینتمای کۆمەڵایەتیەوە، نابێ کورد نکوڵی لەو ڕاستیانە بکا، بەڵام پرسیاری بنچینەیی ئەوەیە ئەو شارە (یا ئەو ناوچەیە) ئینتمانی نیشتمانی چیە؟ لە ڕووی یاساییش ئینتمای هەرێمی چیە؟.. ئەوەش حاشا

---

١. لە دائیرەی ڕەگەزنامەی عوسمانی ناوی نەتەوە نەدەنووسرا، بەڵکو ناوی ئایین و شوێن دەنووسرا، یەکەم جار لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیتحادوتەرەقی بەرامبەر هەر ئەفسەرێکی غەیرە تورک هێمایەکیان بەرامبەر دادەنرا: (ع) بۆ عەرەب، (ک) بۆ کورد..

٢. بۆ زیاتر بڕوانە: دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة، ص٤٨٤.

PDF 4 KURD

هەڵنەگرە کە هیچ نیشتمان و هەرێمێک بەناوی عەرەبی یان تورکمانی یان هەر ناوێکی تر لە دوور و نزیکی ئەو ناوچەیە نەبووە تا ئینتمای بۆ ئەو بگەڕێتەوە[1]، جگە لە کوردستان بە ناوی جیاجیای وەک شارەزوور و بیلاد ئەکراد و ئیقلیم جیبال و ئیقلیم جەزیرە.. ناوی هاتووە، کوردستانیش تەنها موڵکی کورد نییە، موڵکی تورکمان و ئاشووری و لایەنی تریشە، بۆیە زۆر ئاساییە هەروەک هەرمۆتە و عەنکاوە شارێکی زۆرینە مەسیحیە کەچی کوردستانیە، کەرکووک هەرچی بێت کوردستانیە، ناوی کوردستانیش وەک تورکیا نییە لە سەردەمی ڕابوونی نەتەوەیی (لە سەرەتای سەدەی بیستەم) سەریهەڵدابێ بە بڕیارومەرسوم، بەڵکو زیاتر لە (٨) سەدەیە ئەو ناوە هەیە، واتە گوزارشت لە پرۆسەیەکی مێژوویی قووڵی چالاکی سیاسی و کۆمەڵایەتی کورد دەکا لەو ناوچەیە.

## پاساوەکانی تورکمانێتیی ئەو ناوچە

دوای ئەوەی برایانی تورکمان هەستیانکرد کێشمەکێشێک سەبارەت بە ناسنامەی کەرکووک وا درێژەدەکێشی بێ ئەوەی حیسابێکی وایان بۆ بکرێ، بە تایبەتی لە قۆناغی نوێدا، ئەوانیش بەخۆکەوتن و بەدوای بەڵگەی مێژوویی و جوگرافی و سیاسی و یاساییدا گەڕان تا لەو تەپوتۆزەدا بزر نەبن، واتە تاڕادەیەک کاردانەوە بووە پێش ئەوەی قەناعەت بێت، چونکە لە مێژوودا ئەو تەقەڵایەیان کەمتر بەدی دەکرێ، ئێستاش ئەوەی لێیان بەدی دەکرێ دەزانن چییان ناوێ، نایانەوێ

---

١. لە ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ بە ڕوونی ئەوە باسدەکات.

PDF 4 KURD

کەرکووک و ئەو ناوچە بێتەوە هەرێمی کوردستان، بەڵام نازانن چییان دەوێ، بۆیە پرۆژە و وزەیان زیاتر دەچۆڕێتە دەریاچەی پرۆژەی ڕەگەزپەرستی عروبی، لەسەر ئەو بنچینەیە پاساو و بۆچوونی برایانی تورکمان دووبەشە: یەکەمیان کە زۆرینەیە و زیاتر داکۆکی لەوە دەکەن کە کەرکووک و ئەو ناوچەیە عێراقی بێت کە زیاتر گوزارشت لە بۆچوونی دەسەڵاتدارانی ناوچەکە دەکا، ئەوەش زانستێکی وای ناوێت و شتێکی لە پاساوی عروبیەکانی سوننە زیاتر نییە کە لە پێشووتر وەڵاممان دانەوە. دووەمیان کەمینەن، داکۆکی لەوە دەکەن کە ئەو ناوچەیە تورکمانیە، ئەوەش گوزارشتێکی سەلبی نییە، نابێ کورد بەوە پەستبێت، دەبێ ئاسایی بێت ئەگەر بەڵگەی ڕەوای مێژوویی و یاساییان دۆزیەوە، ئینجا ئەگەر لە ڕاپرسیەکی سروشتیدا دەرکەوت ئەوان زۆرینەن لە تەواوی ناوچەکە و خەڵکی ئەوانی ویست دەبێ کورد لە پێش عەرەبەوە پیرۆزباییان لێبکا و پشتگیری لە دەرەنجامی یاسایی و سیاسیەکەی بکرێت، بەوشێوەیە دەچینە نێو پاساوەکانیان کە لە توێژینەوەی پەرت و بڵاو کۆمانکردۆتەوە و بە کورتی و پوختی:

١. دەڵێن تورکمان کۆنترین میللەتن لە عێراق، لەوە پشتیان بە توێژینەوەیەکی (ئۆپیرت) بەستووە کە دەڵێ سۆمەرهیچ پەیوەندیەکی بە زاراوەی ئەوساو ئێستای جەزیرەی عەرەب نییە، هەروەها ڕای (قەلقەشندی) دەڵێت تورکمان (٨) سەدە پێش زاین لەو ناوچەیەدا هەبوونە. کەواتە بەڕای تورکمان ڕەچەڵەکی سۆمەریەکان تورکن کە (٣٠٠٠پ. ز.) هاتوون ئەو ناوچەیەیان ئاوەدانکردۆتەوە، چونکە ئەوان (واتە باپیرەگەورەی تورکمان شارستان و ئەهلی کار و چاوکراوە بوونە، دەڵێن

تورکمان له هەموو عێراق بە چڕی هەبوونە، شارەکانی واسیت و حیللە و بەغدا و بەدرە و زورباتیە و خانقین و کفری و قەرەتەپە.. ئەوان دروستیانکردوون، زۆربەی گەڕەکەکانی شارەکانی بەسرە و بەغدا و سامەڕا و موسڵ تورکمانی بوون، لە سەدەی (١١)ـەوە ناوی تورکمانیان لێنراوە، دەسەڵاتی تورکمانیش نموونەی هەیە لەو ناوچە لەوانە دەسەڵاتی زینەدین کچک لە هەولێر، ئیواقیە لە (جەبەل حەمرین)[١].

٢. مێجەرسۆن لە (رحلة متنكر الى بلاد ما بين النهرين، ص١٥٨) دەڵێت (تشتهر كركوك بتركمانها و فواكهها و نفطها.. و سكانها يتكلمون التركية)، هەروەها لونکرینک لە (أربعة قرون من تاريخ العراق الحديث سالی (١٩٢٥) ئەویش دووپاتی زۆرینەبوونی تورکمان لە تەوەری تەلەعفەر موسڵ هەولێر کەرکووک کردۆتەوە. حەننا بەتاتۆ لە کتێبی (العراق ج٣، ص٢٢٤) بەڕوونی دەڵێ کەرکووک شارێکی تورکمانیە.

٣. دەڵێن لەسەر بنچینەی ڕەگەزی تورکمانی لە کەرکووک دەنگ بە عێراقی نەبوونی ویلایەتی موسڵ درا.

٤. لە بەڵێننامەی (٩ ی ١٠) بەڵێننامەکەی (ڕۆژی٢٨ /کانون دووەم/١٩٣٢) تێیدا هاتووە کە زۆرینە ناوچەی کەرکووک تورکمانن بۆیە لەوێ زمانی تورکی دەبێ فەرمی بێت.

٥. دەڵێن لە ساڵی (١١٦٢ک = ١٧٤٩ز) تورکمانەکانی کەرکووک ڕاڕەوی کاسۆلیکیان وەرگرت و بوونە کلدان، ئەوانە لەگەڵ کلدانی بنەڕەتی عێراق جیان، بەڵکو لە ڕەچەلەکدا دەگەڕێنەوە

---

١. بۆ زیاتر بڕوانە: توێژینەوەیەکی بە پێزی سەنعان ئەحمەد ئاغا بە ناونیشانی موسوعة التركمان العراقي – اصالة التركمان.

PDF 4 KURD

بۆخێڵەکانی(ئۆغوز)ی تورک. واتە کلدانی کەرکووک ئاینیان جیایە بەڵام ڕەگەزیان تورکمانە[1].

٦. لە توێژینەوەیەکی (العمید المتقاعد یاوز نورالدین صابر اغائوغلو) دەڵێت: کەرکووک کوردستانی نییە بە بەڵگەی ئەوەی کە یەکەم کابینەی حکومەتی عێراق دروستبوو لە (١٩٢١) یەک وەزیری کورد لەو حکومەتە نەبوو، بەڵام وەزیرێکی تورکمان لە کەرکووک هەبوو، لە هەندێ توێژینەوەی تریان باس لە ئاماری فەرمانبەران و خوێندکاران دەکات و دەڵێن تورکمان زیاتر بوون لە کوردان.

## کورتە هەڵسەنگاندنێک:

بۆئەوەی توێژینەوەکە بێلایەن بێت پاساوی هەمولایەک بڵاودەکەینەوە، وەڵامی بۆچوونی هەڵەش نادەینەوە بەڵام نابێ هەڵە زانستیەکانی هیچ لایەکمان بەسەردا تێپەڕبێت، لەسەر ئەو بنچینەیە، هەندێ هەڵەی زانستی لەو پاساوانەی برایانی تورکمان ڕاستدەکەینەوە:

١. ڕاستە تورکمان لە هەموو عێراق هەبوو بەڵام ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین دەبینین تەنها لەو ناوچانە ماون کە کوردستانین، کەواتە چارەنووسی تورکمان زیاتر بەندە بەو داوا ڕەوایەی دژبە تەعریب و باڵادەستکردنی ڕەگەزێک بەسەر ڕەگەزێکی تر کە لە لایەن قوتابخانەی مرۆیی و تەواوی ئاینەکان حەرامکراوە.

٢. ئەوەی تا ئێستا ئاشکرا بێت هەرسێ لایەن (عەرەب و تورکمان و کورد) سۆمەری بە باپیرە گەورەی خۆیان هەژماردەکەن، کەچی نەوەی

---

[1] لەو بارەیەوە بڕوانە: احداث و وقائع کرکوک (من١٧٠٠ الی ١٩٥٨).

PDF 4 KURD

خۆیان ماون جیان لە هەرسێ لا، خۆزگە ئەو یەک باپیریە وای لەو نەتەوانە بکردبایە گیانی هاریکاری و لێبوردەیی و برایەتی بۆ دروست بکردبانایە، بەلام وا نابینری هەریەکە دەیەوی خۆی زاڵ بکا بە بچووککردنەوەی ئەوی تر.

٣. ئینجا دەڵێن چونکە سۆمەری باپیرانی تورکمان شارستان و ئەهلی شار و پیشەدار بوونە، سەنعان ئەحمەد ئاغا قەساب لە توێژینەوەیەکی تر سەبارەت بە لێکتر جیاکردنەوەی کورد و تورکمان لە هەولێر بەو هۆکارە لێک کردۆتەوە گوایە کرمانج (کورد) پیس و چڵکن بوون، ئەو ڕایە دەگەڕێتەوە بۆ فەرهەنگی ڕەگەزپەرستی ئیتحادوتەرەقی کە ناوی لە عەرب نا (پیس عرب)..کەچی یاقووتی حەمەوی لە (معجم البلدان ج١. اقلیم السبع) دەڵێت تورک وەک دڕندە بوون و وەسفیان بە (وحش الجبال) دەکا. کلیمنسۆری سەرۆکی فەڕەنسا لە کۆنگرەی ئاشتی باسی لەوە کرد کە تورک (نقص الکفاءة)ی هەیە ناتوانی میللەتی تری لەژێر دەست دابێ، ئەوە بووە بنچینەی یاسایی ڕێککەوتنی سیڤەر بەتایبەتی ماددەی(١٣٢)ی ئەو ڕێککەوتنە، لە ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵیش باسی تورکمانی ناوچەی ویلایەتی موسڵ بە (مرتزقة العباسیة) دەکا[١]، لە شوێنێکی تر دەڵێت لەنێو عوسمانی کە ناوی تورک دەهات وەک گەمژە و غەشیم (همجی) سەیردەکرا تا (١٩٠٠) لەسەر دەستی (بزووتنەوەی عموم الترک) بوونە جێی شانازی[٢]، تەنانەت لە سەردەمی عوسمانیش کە

---

١. تقریر ولایة الموصل.. ص١٣٢.

٢. تقریر ولایة الموصل، ص١٢٧، ١٢٩، ١٣٢- بزوتنەوەی (عموم الترک) نەبووە، ڕەنگە مەبەستی ئیتحادوتەرەقی بێت.

PDF 4 KURD

حوکمەکە تورکی بووە کەچی هەرناوی تورک هاتبی هاوتای (اعراب- بێ ئیدراک)[1] بووە- سەبارەت بە وەسفی (بێ ئیدراکی تورک) بڕوانە (ساطع الحصري - محاضرات في نشوء القومية) و (دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة – د.عثمان علي)، ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە دەستووری عوسمانی (مشروطية) دەبینین پێکهاتووە لە (١١٩) مادده (کە دەکاتە ٤٣٦٨ وشە) بە هیچ وشەیەک ناوی تورک نەهاتووە، ئەوە مێژوە ئەگینا لای هەموو لایەک دەبێ وەک برا سەیری یەک بکەین کەسمان لە کەس گەورەو نەجیبتر نیین.

٤. ئەگەر دەڵێن مێجەرسۆن ولونگرینک و حەننا بەتاتۆ گوتوویانە کەرکوک تورکمانیە.. دوای وردبوونەوە بەو شێوەیان نەگوتووە هەریەکە لەوانە لە شوێنی تر کوردستانیبوونی کەرکووکیان بەیانکردوە، حەنا بەتاتۆ لە (العراق، ج٣، ص٢٢٤) وای گوتبێ لە (ج٢ العراق، ص٤٥١) دەڵێ نیوەی کەرکووک کوردن ئەویتریش تورکمان و عەرەب و مەسیحین، لە موعجەم و گەڕیدە و ئامارەکان ناوی تورکمان لە کەرکووک نەدۆزیەوە تا نزیک سەدەی بیستەم، یان بە وردتر دوای ئینقلابی ئیتحادوتەرەقی لە (١٩٠٨) کە تەقەلایدا ژێر دەستی عوسمانی بتورکێنێ و ئەوەی تورکی نەزانیبایە و نەیگوتبووایە من تورکم ئەوا دەردەکرا لە فەرمانبەری، هەر بۆیەش دەبینین لە خودی پانۆرامای ڕووداوەکانی کەرکووک کە لە (احداث و وقائع كركوك

---

١. بۆیە کەمتر تورک لە پایەی دەوڵەتی عوسمانی بوو زیاتر سەرباز و فەرمانبەری سادە بووە، لەمەوە بزوتنەوەی تۆرانی و کەمالی سەریهەڵدا و گوتیان تورک لە هاوکێشەی عوسمانی زۆر مەغدورە لە بەرامبەر کورد و چەرکەس و ئەرنائووت و عەرەب،... پاساوی بنچینەیی مستەفا ئەتاتورک لە گوتارەکانی ڕۆژی ١، ٢، ٣ ٣ ١٩٢٤سەبارەت بە هەلوەشانەوەی خەلافەتی عوسمانی لە ئەنجومەنی باڵای تورکی - پە ڕلەمان- ئەوەبوو.

PDF 4 KURD

مـن ١٧٠٠ الـى ١٩٥٨) كـه لـه لايـەن توركمـان نووسـرايتەوە و هەوڵيـداوە جموجـۆڵی سیاسـی كـوردو خـەڵكی تـر بشـارێتەوە..كـەچی تـا دوای ئـەو بـەروارەی سـەرەوە نـەیتوانیوە یـەك نموونـە بدۆزێتـەوە بـاس لـە بـوونی توركمان بكا، بابڕوانینە ئەو گەریدانـەی هاتوونـەتـە كـەركووك كە بەشێكیان لەو كتێبەش تۆماركراوە: لیوناردۆ ڕالف لـە (١٥٧٤)، میرزا ئـەبوتاڵیب هیندی (رحلات في اسيا و اوروبا و افريقا-١٧٧٩)، جاكسـۆن لـە كتێبی(المشـاهدات البريطانية لمسيبوتاميا-١٧٩٧)، ئـۆرین دۆپریـەی فەرەنسـی(رحلـة مـن ايـران-١٨٠٧)، جـیمس بینگـام (رحـلات فـي بـلاد مـابين النهـرين-١٨١٦) ڕۆبـەرت كیربۆرتـەر(رحلات في جورجيا و إيـران و أرمينيـا-١٨١٨)، جیمس ڕیـچ لـە ١٨٢٠، ج شـیل لـە (١٨٣٦)، كـاڕل ڕیتـر لـە (١٨٤٤)، مـافرینز لـە (١٨٩٢)، تادەگاتـە مـاڕك سـایكس (سـفرة فـي ولايـات الخمسـة التركيـة -١٨٩٩)، فـون هامری نەمساوی لە (تاريخ الدولة العثمانية)[1]... باسی توركمان لـە كـەركووك ناكەن، یەكەم كەس مێجەرسۆن باسی توركمانی كردوە لـە سـاڵی ئینقلابەكە (١٩٠٨) هـاتووەتـە ئـەو ناوچـە و كتێبـی (رحلـة متنكـرة الـى میزوپوتامیـا) نووسیە و ئەویش بـە سـەلبی بووە، ئـەو نـاڵێ توركن وەك لـە پاسـاوی بـرا توركمانەكان هاتووە، دەڵێ پیاوی توركن (تورك+مـان بـە ئینگلیزیەكـەی ئـەو مانایە دەدا) مەبەستی فەرمانبـەران بووە، بـەو كوردانـەی دەگوت كـە پیاوی عوسـمانین[2]، لـەو كـاتی ئـەو تێڕوانینـە دروسـتببوو هـەر مێجـەرسـۆن وای نـەگوتووە، ئـەوەتا ڕۆژهەلاتناسـی جیـورجی (ئـەلبرت مینشـا شـفیلی)

---

١. فۆن هـامری دەڵـێ: موسـڵ كوردن و بـە كـوردی قسـەدەكەن بـەڵام تـوركی و عەرەبیش دەزانن و قسەی پێدەكەن.

٢. محەممەد ئەمین زەكی بەگ بە وردی ئەو پرسەی ڕوونكردۆتەوە.

PDF 4 KURD

دەڵێت:(جزءا من العوائل الارستقراطية المتنفذة في كركوك من اصول كردية رغم انها تسمى تركية و من بينها النفطجية و اليعقوبيين و القيردار و غيرهم الذين ينتمون الى عشيرة زنكنة الكردية، و كثيرا ما كان الكرد يطلقون لفظة الترك على الموظفين المدنيين و العسكريين و ابناء الاستقراطية الكركوكية)[1]، بەو پێیە شانازی نییە بۆ براتورکمانەکان کە (تورکمان بریتی بن لە: کوردی پیاوی تورک)، لە بیریشمان نەچی مێجەرسۆن لە شوێنی تر دەڵێ کرکوک کوردستانیە، ئەوە نیفاق نییە بەڵکو مەتەڵەکە لەو تێڕوانینە بەهەڵەیەی سەروو دێت.

٥. سەبارەت بە ڕاپرسیەکە بۆ مەلیک فەیسەڵ دەنگ نەدانی کەرکووک بۆ عێراق وەک بوویتە پاساوی تورکمانیەتی ئەو شارە و لەگەڵ ڕاپرسیەکەی ویلایەتی موسڵ تێکەڵکراوە، کەرکووک بەرامبەر مەلیک فەیسەڵ دەنگی نەدا، هەڵوێستێکی جوانی تورکمانە، لە هەموو سلێمانی دەنگ بۆمەلیک فەیسەڵ و عێراق (٣٢) دەنگ بوو، لە کەرکووکیش تەنها (٦٤) دەنگی هەبوو (١٩٧) دەنگیش بە مەرجی ماف بۆ کورد، میس بیل (لە نامەی ڕۆژی ١٩٢١/٨/١٤ بۆ بەریتانیا) ئەو پرسەی بە جوانی ڕوون کردۆتەوە دەڵێ: زۆربەی ناو کەرکووک تورکمانن و گوندەکانی دەوروبەریش هەموی کوردن، هەردوولا داوای دەوڵەتێکی کوردیان کرد لەژێر چاودێری ئێمە، تەنها دووگەڕەک لە ناو کەرکووک داوای گەڕانەوەی عوسمانیان کرد[2].

---

١. لە ڕاپۆرتی (همفریز- مەندوبی بەریتانی) ئەو تێبینیەی نەک لە کەرکووک لە سلێمانییش کردبوو لە ڕاپۆرتی ڕۆژی (١٩٣١/٤/٢٣)دا دەڵێ: (%٩٩)ی سلیمانی کوردن کەچی (%٧٠)ی فەرمانبەرانی غەیرە کوردن.

٢. العراق في الرسائل مس بيل، ص٣٣٥.

PDF 4 KURD

٦. سەبارەت بە بەڵێننامەی (ژ:٩) لەسەر داوای کورد بوو دوای ئەو هەموو شەڕو شۆڕەی کە بەخۆپیشاندانی بەردەرگای سەرای سلێمانی بەناوبانگە، بەڵێننامەکان لە لایەن لیژنەیەک نووسرایەوە لە (١٩/مایس/١٩٣٢) پێکهاتبوو لە:

١. داود حەیدەری / سەرۆک (کورد).

٢. غەیاسەدین نەقشبەندی/ جێگر(کورد).

٣. عەبدولجەبار ئەلتەکەرلی /بڕیاردەر، سەبارەت بە وەرگیرانی عێراق بوو لە عصبة الأمم پێکهاتبوو لە (١٠) بەڵێننامە کە عێراق پێشێلی نەکا و ئاگای لە کورد و کەمینەکانی تر بێت.

لە بەڵێننامەی ژمارە (٩) هەم لە عربیەکە و هەم لە ئینگلیزیەکەی بەوردی لێمان توێژیەوە ئاوا نییە وەک لە پاساوی برایانی تورکمانیش هاتووە، خۆی (٣) بڕگەیە، لە بڕگەی (١) و(٢) و باسی هەر چوار لیوای کورد (موسڵ، هەولێر، کەرکووک، سلێمانی) کە دەبێ ڕەچاوی مافیان لە زمان و فەرهەنگ و ئیدارە دەکا، ئینجا دێتە سەر ئەو ناوچانەی لە کوردستان تورکمانی لێیە وەک کفری و کەرکووک دەڵێ شان بە شانی کوردی و عەرەبی زمانی تورکیشی لێ فەرمی بێت ئەگەر زۆرینە بوون.

لە ماددەی (١٠)یش باس لە پێشێل نەکردنی دەکا.

٧. سەبارەت بە ئەوەی کە کەرکووک کوردستانی نییە چونکە لە یەکەم کابینەی حکومەتی عێراقی هیچ وەزیری کوردی تێدا نەبووە و وەزیرێکی تورکمانی تێدا بووە، لیستێکی ناوی وەزیرەکانیشی بڵاوکردیتەوە تێیدا دوو وەزیری کوردی تێدایە (جەعفەر عەسکەری و حەمدی بابان) دیارە نەیزانیە ئەوانە کوردن، سەرەڕای ئەوەش ڕاستدەکا کورد بەشدار نەبووە، وا دیارە نووسەر بێئاگا بووە لەوەی کە ئەوساکە عێراق تەنها لە ویلایەتی بەسرە و بەغدا پێکهاتبوو، خۆ کێشەی ویلایەتی

موسڵ چارەسەر نەکرابوو، ئینجا کورد خەریکی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی بوو بە پێی ڕێککەوتنامەی سیڤەر و ئاواش بۆ لێژنەکەی کۆنگرەی قاهیرەی (١٩٢١) بەجێما، هەرئاواش لە لایەن بەریتانیەکان وەڵامی لایەنی تورکی دراوەتەوە لە کێشەکەی موسڵ گوتیان لە کاتی دروستکردنی حکومەتی عێراقی کوردستان بە پێی ماددەی (٦٤) چاوەڕێی بەدەوڵەتبوونی دەکرد[١]، کەواتە کورد بەشدار نەبوون لە یەکەم کابینەی حکومەت، هەروەک لە ڕاپرسیەکەی مەلیک فەیسەڵیش لە کەرکووک و سلێمانی و هەولێر بەشدار نەبوون یان دەنگیان پێ نەدا.

لەبارەی زۆری خوێندکار و فەرمانبەرانی تورکمان ئاساییە و هۆیەکەمان باس کرد، ئێمە لەو توێژینەوەیە ئەوەندە کێشەمان لەگەڵ زۆر و کەمی تورکمان لە ناو کەرکووک نییە، کەس ناڵێ کەرکووک کوردن دەڵێن کوردستانیە، سەرەڕای ئەوەش ئەگەر ئێوەی برا تورکمان ئەو جۆرە ئامارانە بەکاردەهێنن ئەوا برایانی کوردیش دەستکورت نیین لەو ڕووەوە، ئەوەتا بەڵگەنامەیەکی بەریتانی لە لایەن (د. کەمال مەزهەر)ەوە بە پێچەوانەی ئێوە پێشاندەدا، دەڵێ کاتی بەریتانیا کەرکووکی داگیرکرد ئەنجومەنێکی حوکمی (١٢) کەسی لە پێکهاتەکانی کەرکووک دروستکرد بەو شێوەیە: کورد (٦) کەس، تورکمان (٣)، عەرەب (١)، مەسیحی (١) کەس، یەهوودی (١) کەس[٢].

---

١. تقرير ولاية الموصل، ص٥٠.

٢. ١. ئەحمەد خانەقا- کوردی ٢. ئەحمەد ئەحمەدی ئەفەندی- کوردی ٣. جەمیل بەگ بابان- کوردی ٤. عومەر ئاغا- کوردی ٥. شێخ حەمید تاڵەبانی- کوردی ٦. ئاغا بەگ- کوردی ٧. مەجید ئەفەندی- تورکمان ٨. حسێن بەگ نەفتچی- تورکمان ٩. حەجی جەمیل بەگ- تورکمان ١٠. حسقیل ئەفندی- یەهوودی ١١. قوستەنیین ئەفەندی- کلدانی ١٢. حسێن عەلی نوێنەری بیابان (الصحراء) – عەرەب.

PDF 4 KURD

٨. سـەبارەت بـە بـوونی حکومـەتێکی تورکمـانی بـە ڕابەرایـەتی (زەینـەددیـن کچـک)...، ئـەو پیـاوە بـاوکی سـوڵتان مزەفـەری زاوای سەلاحەددینی ئەیوبیە، بە پێچەوانە لە ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ لاپەڕە (١٠٥) دەڵێ تورکمان لە مێژوودا هیچ ناوچە و هەرێمێکیان نیە و نـەبووە بـەناوی ئـەوان بێت، مەگـەر کـەمێک بـەیات، تەنانـەت عەشیرەتێکیشـمان نەبینی بەناوی تورکمان... ئینجا لـە لاپـەڕە (١٩٨-١٩٩) لـە لایـەن لیژنەکە ئامـاری سـلێمانی و هـەولێر و کـەرکووک بڵاوکرایتـەوە تورکمـان بـەو شـێوەیە: لـە کـەرکووک (٢٦%) و هـەولێر (٣%). لـە لاپـەڕە (٢٢٣)ـی (استنتاج عامة) دەڵێ زۆر بە وردی لە ویلایـەتی موسڵ و کەرکووک و خواروشـی تـەنها دوو ڕەگـەزی سـەرەکی بەدیدەکرێ کورد و عـەرەب ئەوانی تر پەرت و بڵاون و لە شێوەی پێکهاتە نیین.

لە ڕاستیدا کێشەی بنچینەی ئێستای تورکمـان لـەوە دێت کە ئەوان هەرێمێکیان نییە ئەگـەر بچوکیش بێت، تـا بـە پێی یاسـای نێودەوڵـەتی و دەسـتوور مافـەکانی چـارەنووس (لـە ئۆتـۆنـۆمی یـان فیـدراڵی یـان هـەر ئیدارەیـەکی سـەربەخۆ) بیانگرێتـەوە، نـابێ کـورد لـە کاردانـەوەی ئـەوان دەمارگیر بێت بەرامبەر ئەو داوایەیان ئەگـەر هـەرێمێک دروسـتبێت وەک خۆیان دەڵێن چ لە موسڵ یان لـە کـەرکووک و ناوچـەی بـەیات بـە هـۆی ڕاپرسـی دەرکـەوت ئـەوان زۆرینـەن و دەیانـەوێ هـەرێمێک پێک بهێنن یارمەتی بدرێن (ولایجرمنکم شنأن القوم علی ان لاتعدلوا...)، ئەگەریش زۆرینـە نـەبوون ئـەوا ئـەوانیش دەبـێ ڕوو لـە بنیادنـانی برایـەتی و (هاوڵاتیبوونی دەستووری) بکەن لە کوردستان، چونکە لە مێژووی نوێ وادەبینین هـەر کاتێ کورد دەسـەڵاتێکی بە خوێن و فرمێسک و ئارەقە پەیداکردبێت ئەوا یەکسـەر برایانی تورکمـانیش بارودۆخیان بـاش بووە،

پێچەوانەشی بە پێچەوانە، وا پێدەچی ئەوانەی خۆیان کردۆتە نوێنەری تورکمان ئەوەندە شارەزاش نەبن یاخود بە هۆی تر نەیانەوی بە درووستی کار لە پێناوی بەرژەوەندی تورکمان بکەن، وەک پێشسنیارێک لە بەشی (البراهين التاريخية) لە ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ لاپەرە (١٥٧)دا باسی هەرێمێکی فراوانی نێوان بەغدا و موسڵ دەکا دەڵێ: ئەوناوچەیە پێی گوتراوە تەتەرستان کە یەک ڕەگەزن لەگەڵ تورکمان بۆیە واچاکە ئەوان بە دوای زێدێک بگەڕێن بەڵام بە دەست بەسەراگرتن نەبێت (وەک ئیسرائیل یان تەعریبی برایانی عەرەبمان) بە خواستی دانیشتوانی ناوچەکە بێت.

٩. ئەوەی هەموو بەڵگە و تەقەڵای برایانی تورکمان لاواز دەکا ئەوەیە تا ئەو ساتە بەڵگە و سکالایەک نادۆزیەوە لە ئەرشیڤی عێراقی یان بەریتانی یان عوسمانی یان فەرەنسی یان بەڵگەنامەیەک (وەسفی پێناسی بەڵگەنامە هەڵگری) تێیدا داوای کەرکووک یان هەرێمێکیان لەو عێراقە کردبێ، یان شۆڕش و ڕاپەڕینێکیان بۆ کردبێ، تەنها لەو کاتانە کە کورد داوادەکەن ئەوانیش بە شێوەیەکی وا داوا دەکەن گومانی لێ بکرێ، چونکە ئەوان داوا لە عێراق ناکەن داوا لە کورد دەکەن بۆیەش بە ئەجێندای دەرەکی تۆمەتباردەکرێن.

### کوردستانیبوونی ناوچە (دابڕێنراوەکان)

پێش ئەوەی کە بە کەللە ڕەقانە بڵێین ئەو ناوچانە کوردستانین، با بزانین دەشێ بڵێین سەر بە هەرێمی ترن؟ ئایا هیچ هەرێمێک لەو ناوچەیە نەبووە؟ هەریەکە لە ناوەکانی کۆنی وەک (بیلاد بابل، بیلاد ئاشوور، سۆمەر، عێراقی عەرەبي، سەواد، میزۆپۆتامیا، بیلاد ڕافدێن،

بیلاد مابەین نەهرێن، دیرە، مونتەفیک، عێراقی عەجەمی، کوردستان، ئیقلیم جیبال،...) دەبینین ئەو ناوچانە لەوانە نزیکە کە کوردستانیان لێ دروستبوو، وەک میزۆپۆتامیا، جەزیرە، عێراقی عەجەمی، ئیقلیم جیبال... بەڵام هەرگیز دوور و نزیک پەیوەندیی (ناوچە ناکۆکەکان) بە (بیلاد بابل، ئاشوور، سۆمەر، سەواد، عێراقی عەرەبی، مونتەفیک) نەبووە، کەواتە کێشەی ناوچە ناکۆکەکان لەسەر ئەوە نییە ئاخۆ عەرەبستانە یان کوردستانیە، بەڵکو عێراق خۆی بوەتە لایەن (تەرەف)، وەک ئەوە وابێت لە نێوان دوو دەوڵەتدا بوو‌بێت، ئەوەش جێی سەرسامی بیانیەکانە کە یەکەم جار دێنە عێراق و سەیری ئەو کێشەیە دەکەن دەڵێن ئەوە ئاسایی نییە، خۆ کوردستان دەوڵەتێکی تر نییە ئەو کێشەیەی لەگەڵ عێراق هەبێت و ناوی (المناطق المتنازع علیها) هەڵگری، ئەوەیان ڕاستە ئەگەر ئەو دپلۆماسیە بیانیانە بەتایبەتی (**UN**) شارەزا نەبن، ئەو سەرسامیە کورد دروستی نەکردوە، خودی حکومەتەکانی عێراقی دروستیانکردوە، لە مەرکەزەوە نەک لە هەرێمەکانەوە، واتە ئەو زوڵم و زۆرەی لەو ناوچانە کراوە (هەرێمێک لە ناو عێراق) پێی هەڵنەستاوە بەڵکو خودی مەرکەز (بەغدا) پێی هەڵساوە، بە تەعریب و بە گۆڕینی دیمۆگرافیای ناوچەکە، بەناو گۆڕینی بە ڕاگواستن و گواستنەوەی شار بۆ شار.. بە کۆمەڵێک تەقەلای کۆمەلایەتی و سیاسی و یاسایی و ئیداری و سەربازیانە، مەبەست ئەوە بووە کۆتایی بەوە بێنێت کە ئەو ناوچەیە ناوی کوردستانی هەڵگرێت، هەر خۆی لە خۆیدا ئەوە (سید الدلائل)ـە کە ئەو ناوچەیە عەرەبی نییە و کوردستانیە، ئەگینا ئەو تەقەلایەی بۆچیە؟



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

کەواتـە حکومـەتی عێراقـی وایکـردوە کێشـەیەک هـەبێ لـە نێـوان کوردستان و مەرکەزدا، ئیتر هەقە ناوی یاسایی (المناطق المتنازع عليها) هـەڵگری وەک کێشـەیەکی نێودەوڵـەتی، ئێسـتا کارەکـە ئاسـاییە بـۆ چارەسەرکردن و بەدواداچوون بۆ دۆزینەوەی ناسنامەی ئەو ناوچەیە کەوتە نێوان دوو لا: عێراقی و کوردستانی.

هەڵبەتـە نـە کـورد نـە عـەرەب نکوڵی لـە عێراقیبوونی ئێستای ئـەو ناوچانە ناکەن، کێشـە لەسـەر ئەوەیە ئاخۆ لـە ڕووی مێژووییـەوە ئـەو ناوچانـە عێراقیبوونـە (عێراقـی عـەرەبی)، کـەواتـە بـە دیـوێکی تـری پرسیارەکە ئەوەیە پێش ئـەوەی بزانین کوردستانیە، با بزانین عێراقی بـووە لـە هـیچ سـەردەمێک لـە سـەردەمەکانی پـێش (١٩٢١). لـەوەش پێویستمان بەوە دەبێ سنووری سەرووی عێراقی عەرەبی دیاری بکەین پێش ئەوەی سنووری خوارووی کوردستان دیاری بکەین.

### سنووری سەرووی عێراق (عێراقی عەرەبی):

١. ناوی عێراق و پەیوەندی بە عەرەب و سنووری ئێستا: لە بنەچەدا ناوی عێراق لـە ئـەراکی فارسـی هـاتووە، یـان وەک یـاقووتی حـەمـەوی (١١٧٨ز) دەڵێ لە (ئیراه) هاتووە، بە پێی (هنری فورستر) ناوی عێراق لـە سەدەی (٧) سەریهەڵدا[١]، ئەو ناوچەیە بە ئیرانشار ناودەبرا (هـەروەک لـە

---

١. بڕوانـە: سـیاحتنامە/ ئـەولیا چەلـەبی، شـەرەفنامە/ شـەرەفخانی بەدلیسـی، معجم البلدان/ ياقوت حموی، الصحاح/ الرازي..... -نشـأة الدولـة العراقيـة – ج١، ص١٣.

نامەکەی ئەسکەندەر بۆ ئەرستۆ و وەڵامەکەیدا ڕوونتر دەردەکەوێ)[1]، یاقووتی حەمەوی و خەوارزمی و ئەلبیرۆنی و تێکڕاییەک هەیە (وەک ئەرستۆ) دەڵێن عێراق بەشێکە لە ئیرانشەهر و بیلاد جیبال، دیارە هەندێ جاریش بە عێراق گوتراوە (دل إيران شهر)[2]، لە تەوراەت (٥) جار بە(ارام نهرين) هاتووە لە تەرجەمە عربییەکەی، ئەویش لە بنەچەدا لە میان ڕۆزانی فارسی هاتووە وەک یاقووتی حەمەوی باسیدەکا.

تا ئەو دواییەش عەرەب لە ناوەڕاستی عێراقی ئێستا کەمینە بوون، سەرەتا مانای جوگرافی عێراق هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی فارسی دەگرتەوە[3]، بۆیە ئەو کەسایەتیانەی لەقەبی (العراقي) هەلگرتووە زیاتر کورد و عەجەم بوونە، دوای لە کۆتایی سەدەی (١١) کووفە و بەسرە بوونە (العراقان)، بە شێوەیەک بەسرە (العراق العربي) پێ دەگوترا و لە (کوفە) بەرەو بەغدا و ڕوو لە ئێران و سەنەد بە (العراق العجمي)

---

١. ئەوە نامەی ئەسکەندەرە: ... أنه شاهد بإيرانشهر رجالا ذوي أصالة في الرأي، وجمال في الوجوه، لهم مع ذلک صرامة و شجاعة.. ئەوەش نامە وەڵامی ئەرستۆیە بۆ ئەسکەندەر: ... فهمت کتابک في رجال فارس. فأما قتلهم فهو من الفساد في الأرض ولو قتلتهم لأنبت البلد أمثالهم أن إقليم بابل يولد أمثال هؤلاء الرجال، من أهل العقول و السداد في الرأي، و الاعتدال في الترکيب... (ابن مسکويه، تجارب الأمم، ج١، ص٢٣).

٢. بڕوانە: (ج١ معجم البلدان) لە ڕاڤەی إيران شهر: .. کانت أرض العراق تسمى دل إيران شهر أي قلب بلدان مملکة الفرس.

٣. معجم ما استعجم: العراق هو مابين هيت الى السند و الصين الى الري خراسان الى الدليم و الجبال و اصبهان..

هـەژمارکراوە[1]، کە نـاوی عێـراق لـە مێـژوو هـات نـابێ ئـەو سـنوورەی ئێستامان بێتە پێش چاو، لـە کێشـەی ویلایـەتی موسـڵ لیژنەکـەی (عصـبة الأمـم) لــە خــەڵکی خــوارووی موســڵی پرســیبوو: ئێــوە عێــراقین یــان عوسمانی؟ لە وەڵامدا گوتبوویـان هـەرگیز نـاوی عێراقمـان نەبیسـتووە[2] !! ناوی عێراق لە ڕێککەوتنامەکانیش نەدەهات تـا کۆنگرەی لـۆزانی (١٩٢٣) بـۆ یەکـەم جـار دوو جـار نـاوی عێـراق لـە مـاددەی (٣) هـاتووە، لـە ڕێککەوتنامەی سیڤەر هیچ ناوێکی عێراقی لە بەشە ئینگلیزەکـەی نییـە، لـە ماددەی (٩٤)ی سیڤەر بەناوی (میزۆپۆتۆمیا العربیة) هاتووە (کەچی سێ جـار نـاوی کوردسـتانی تێدا هـاتووە)، لـە دوای داگیرکردنـی یەکـەم جـار لـۆردکیرزۆن ئـەو ناوچەیـەی میزۆپۆتامیـای ناونـا[3] عێـراق، بـەو شـێوەیە ناوی عێراق گوزارشت لە پەیوەندیەکی مێژوویی و یاسـایی و سیاسـی و نیشتمانی نێوان عەرەب و عێراق ناکا.

٢. ئـەو ناوچەیـە لـە مێـژوودا کۆمـەڵێک نـاوی جـوگرافی شارسـتانی هەڵگرتووە لەوانە: ناوی سۆمەر و ئەکەد و ئاشوور لە هەر سێ نەخشـەی ئیرانتــویتنس (١٩٦ پ ز)[4] و هیکاتابوســی (٤٧٥ پ ز) و هیـرۆدۆتس (٤,٥

---

١. بڕوانە : الصـحاح الـرازي، (معجم البلدان)ی یاقووتی حەمەوی، (لسـان العرب)ی فـەیرۆز ئابـادی، هــەروەها شــەرەفنامە و ســیاحەتنامە و..کـۆدەنگی هەیـە لــەو بارەیەوە. هەروەها لە ڕاپۆرتی (ولایە الموصل، ص٧٢-٧٣) هەر ئاوای بۆچووە.

٢. بڕوانە : تقریر لجنة عصبة الأمم الخاصـة بحل النزاع الترکي البریطاني حـول ولایة الموصل، ص٢١٩.

٣. تقریر ولایة الموصل،، ص٦٦.

٤. بڕوانـە: العـراق فـي الخـوارط القدیمـة- جمـع و حققها الـدکتور احمـد سوسـة، مطبوعات المجمع العلمي العراقي ١٩٥٩- مطبعة معارف - بغداد؛ خریطة رقم (٩).

PDF 4 KURD

سەدە پ ز)[١]. هەریەکە لەوانەش لە نەخشەکەی (هیرۆدتس) هاتووە لە یەک کاتدا لە شوێنی جیاجیای عێراقی ئێستا، فۆرستەر دەڵێ کلد لە دەوروبەری بەسرە و ئەو شوێنەی ئێستا شیعەی لێ نیشتەجێن و دوای ناونرا عێراقی عەرەبی[٢]. هەر لە نێوانی (٢ - ٤ سەدە پ. ز.)دا یۆنانی و ڕۆمانیەکان ناویان لەسەرووی بەغدا ناوە میزۆپۆتامیا و ئەو ناوە بۆ ئەو ناوچە بەکارهاتووە لە هەموو دونیا، بە خوار بەغداش گوتراوە میزۆپۆتامیای خواروو[٣] (بڕوانە نەخشەکانی یۆنانی کۆن و نەخشەکانی تر لە کتێبی: تاریخ العالم– dtv–هیرتمان).

لەدوای ئەوانە ناوی تری وەک (بلاد مابین النهرین) هاتووە، زۆربەی وا تێگەیشتون کە ئەوە تەرجەمەی میزۆپۆتامیا، ڕاست نییە، یاقووتی حەمەوی لە (معجم البلدان) ڕوونیکردۆتەوە و دەڵێ: (بلاد ما بین النهرین) تەرجەمەی (میان ڕۆزان)ی فارسیە[٤]، هەرچی میزۆپۆتامیایە وا پێدەچی لە ناوی سوڕدراوی (جەزیرەی بۆتان) هاتبی لەو کاتەی کە سوپاکەی زەینەفۆن بەو ناوچەیەدا ڕەتبووە. (بلاد مابین النهرین، وادي الرافدین، السواد) بەشێکی لای ڕۆژئاواش بە (بادیە الشام) ناوزەدە بووە، لە خواروو ڕۆژئاواش بە (نەجد) ناودەبرا، لە خوارەوەش لەو دواییە پێ دەگوترا (منتفک) و جەزیرە، وادی رافدێن نزیکە لە بیلاد مابەین نەهرێن بەڵام کەمێک فراوانترە، لە سەرووی جەبەل حەمرین بە ئیقلیم جیبال و بیلاد کورد و بیلاد جەزیرە و شەهرەزوور و کوردستان ناوزەددەکرا.

---

١. هەمان سەرچاوە، خریطة رقم (٦).
٢. هەمان سەرچاوە، خریطة رقم (٣).
٣. فورستر... نشأة الدولة العراقية ج١، ص١٣.
٤. یاقوت حموي، معجم بلدان ج٢، ص٢٧٢.

PDF 4 KURD

لەو شوێنانەی کە ناوی عێراق بە گشتی هاتووە و فراوانترین سنووری پێدراوە، بریتیە لە سنووری بەغدا و بەسرە، لە کاتی دروستکردنی عێراق لە لایەن بەریتانیا وەزارەتی هیندی بەریتانی هەر لە زووەوە تێبینی جیایی ویلایەتەکانی موسڵ و بەغدا و بەسرەی لە (یاسای عوسمانی) کردبوو[1]، دەلیلی عێراقی عوسمانیشیان هەر بەغدا و بەسرەی گرتبۆوە.

٣. سنووری عێراقی عەرەبی و عێراقی عەجەمی. بە پێی: لسان العرب و قاموس المحیط و سیاحتنامە و نەخشەی ئیبن حۆقەل و نەخشەکانی عوسمانی و زۆری تر عێراقی عەرەبی دەوروبەری بەسرەی[2] گرتۆتەوە تا نزیک کوفە، هەرچی عێراق عەجەمیە لە سەرووی بەسرە بەرەو کوفە و بەغدا تانزیک کەرکووک و بۆ ئێران تا سەند سنووری بووە.

٤. سنووری هەردوو عێراق پێکەوە (بێ ئەوەی عەجەمی و عەرەبی لێک جیابکرێتەوە) لە سەدەی (٩) دابەشی (١٢) کورو (ئوستان) کراوە بۆ وەرگرتنی باج بریتین لە (شاد فیرۆز، شاد هەرمز، شاد قوباد، بازیجان خسرۆ، شاد سابور، شاد بهمن، چوار تاسوج، ئەردەشیر، زەوابی، باە قوبادی سەروو، باە قوبادی خواروو، باە قوبادی ناوەراست، باە قوبادی نزم)[3]، وەک دەبینین ئەو ناوچانەی (دابڕێنراوەکان) تێدا نەبووە.

---

١. سیاسة البریطانیا العظمی تجاه مستقبل کردستان، ص٢٠١.

٢. لە زۆربەی کتێبە کۆنەکان و لە خودی نەخشەی ئیبن حۆقەلدا عێراق و بەسرە بەجیا ناویان هاتووە ئەوە (تاریخ جرجاني)یە یەکێ لەو نموونانەیە... أبو عمرو أحمد بن عمر بن أحمد المطرز البکرصباذي کان قد کتب الکثیر و أنفق مالا عظیما في الحدیث و سافر إلی سجستان و بست و هراه و نیسابور و أصبهان و العراق و البصرة و بغداد و الیمن... مات ٤٠١.. (تاریخ جرجاني، ص١٠١).

٣. هەریەکە لە ئیبن قدامە و ئیبن خرداد و مەقدەسی و وکی لیسترنگ لە ص١٠٧-١٠٨ لێی وەرگرتوون.

PDF 4 KURD

٥. عێراق لە موعجەمەکان و گەڕیدەکان:

أ- لە کتێبە کۆنەکان عێراق لەسەر عەرەب پۆڵین نەکراوە[١]، ئیبن بەتووتە لە (الکتاب الروض المعطار في خبرالاقطار ص١٦٣ مادة: بلاد العرب) و زۆربەی سەرچاوە کۆنەکان ناوی عێراق لە (بلاد العرب) تێدا نەهاتووە.

ب- لە نامە وەڵامەکەی ئەرستۆش بۆ ئەسکەندەری مەقدۆنی ناوچەی بابل بە ئیرانشارو عەجەم دەبا، بۆزیاتر معجم البلدان ی یاقووتی حەمەوی زۆر بە وردی ئەو زانیاریانەی ڕوونکردۆتەوە.

پ- لە باشترین دۆخیدا (الإمام الذهبي) لە کتێبی (العبر في خبر من غبر، ج١، ص٦٦٨) باس لە دەسەڵاتی (قائم بأمر الله) دەکا بەو شێوەی خوارەوە: "و أما دست السلطنة بالعراق فكان لجلال الدولة (بغداد و واسط والبطائح و بعض السواد) و ليس له من ذلك أيضا إلا الخطبة فأما الاموال و الاعمال فمنقسمة بين الاعراب و الاكراد و الاتراک..."

ت- خزومی و ئێستاخاری و ئەبولفیدا و ئیبنولفاجی و ئیبن ڕوستە و فەزلوڵلا: بەغداد پایەتەختی عێراقە و موسڵیش پایەتەختی جەزیرەیە[٢]. (أبو عبيد) لە کۆنەوە بەیانیکردوە کە عێراق: طولە و عرضة ثمانون فرسخا[٣].

---

١. کتێبەکانی: (معجم البلدان) و (قاموس الأعلام) و (سیاحتنامە) و (شرفنامە) کە لە سەدەی (١٦) دەرچوون: (اشار الى بلاد الفارس، وجاء فيه انها تشمل: عراق العجم، أذربيجان، أرمينيا، عراق العرب).

٢. تقرير ولاية الموصل، ص٦٩.

٣. العراق في آثار الفتن... المصدر السابق، ج١، ص٢٥٩.

PDF 4 KURD

هەرچی جوگرافی ناسەکانی ئەو دواییە لەوانە:

ج- هەریەکە لە لازاریف و نیکیتین و مینۆرسکی: سەبارەت بە ویلاتی موسڵ، سنووری عێراق بریتیە لە سنووری سەرووی دەشتایی (سهل الرسوبي) بیلاد ما بێن نەهرێن..

چ- (فۆرستر)یش: دەڵێت سنووری سەرووی عێراق دەگاتە هێلی (٣٤)..

ح- زۆر بە ڕوونی (کی لیسترنگ) لە (بلدان الخلافة الشرقية، ص١١٦) دەڵێت سنووری عێراق نەگەیشتۆتە نزیک موسڵیش، موسڵ لە سەدەی (١٠) هەمووی کورد بوون، ئیبن حۆقلیش هەروا دەڵێت و گەڕەکانیشیان بە ناوی: لاری و هەزبانی و حەمیدی..بووە.

خ- (کوتلوف) وا باسی سنووری سەرووی عێراق دەکا: حوضي نهري دجلة و الفرات من حوالي بغداد الى الجنوب من مدينه بغداد، اما شمال بغداد فهو منطقة كوردستان الجنوبية[١].

٦. سنووری عێراق لە نەخشەکان: بەشی زۆری نەخشە کۆنەکان لە دیاریکردنی عێراق جیاوازیەکی وایان لە نێوان عێراقی عەرەبی و عەجەمیدا نەکردوە، ئینجا کەمێک نەبێت ئەوانی تر بە ناوی میزوپۆتامیای خوارووی یان (بلاد مابين النهرين الجنوبية) دەربڕاوە هەندێکیان لێ هەلدەبژێرین:

ا- ڕوونترینیان نەخشەی ئیبن حۆقلە (٩٩٧ز) سنووری عێراقی عەرەبی لە هەر چوار لاوە دیاریکردوە لە سەرووی بەسرە ناگاتە کوفە[٢].

---

١. کوتلوف، ثورة العشرين، ص٢٥.

٢. خارطة رقم: ١٩ إبن الحوقل- (العراق في الخوارط القديمة).

PDF 4 KURD

ب- لـه نەخشـەی قـەزوینی لـە ڕۆژهـەڵاتـی دیجلـە و نزیـک بەغـدا لـە چوارگۆشەیەکی بچووک هاتووە[1].

پ- لە نەخشەی بەلخی (٩٣٤ مردووە) بـە نـاوی (سـواد العراق) هـاتووە: هەنـدێ ناوچـەی (بابـل و کوفـە و بەسـڕە و واسـیت) دەگرێتـەوە، هەڵبەتە لە لایەن جوگرافیناسە عەرەبەکان ئەو نەخشـەیە بە (صـورة العراق) لە (العراق في الخوارط القديمة) پۆلێنکراوە، لـە وێ سـنووری سەرووی بە ڕوونی دیاریکراوە کەمێک لە سامەڕا (لەوێ بە سر من رأی- تۆمارکراوە) ناگاتە تکریت[2].

ت- نەخشەکانی خەواریزمی (٨٤٥ز)، بنیامین بن حـەننا (١١٦٠-١١٧٣ز)، ئـەبـو حـەسـنا بـن سـەعید(١٢٧٤ز)، ئـەلبیرۆنی(١٠٣٠ز)، ئـەبولفیدا (١٣٣١ز) ئیبن سەعیدی مەغریبی (١٢٧٤)، عێراق بریتیە لەو نەخشانە لـە خـوارووی بەغـدا تـا نزیـک کەنـداو، نێـوان دجلـە و فـوڕاتیش لـە سەرووی بەغدا بە جەزیرە هەژمارە.

ج- لـە نەخشـەی مـەقـدەسـی و مـەسـعودی لـە (ص٣٦ التنبيـه) دەقەکـەی واهاتووە: (إن العراق يشتمل على البلاد المحصورة بين الـزابين و الكائنة في ماوراء سامراء، و يمتد حتى حدود "السن" و "التكريت"مع القسـم من منطقة هوليوان المقارب للجبل و كذلك جزء من منطقة الهيت)[3].

چ- لـە نەخشـەی قـەزوینی (سـەدەی ١٣) زۆر بـە وردی عێـراق و بەغـدا وا لێک جیاکرایتـەوە هـیچ پینـە و پاسـاوێک هـەڵناگری، چونکـە هەریەکـەی لەناو چوارگۆشەیەکی بە جیاکردەوە[4]. عێراق کەوتۆتە ڕۆژئاوای بەغدا.

---

١. هەمان سەرچاوە، خارطة رقم: ٣١ للقزويني.

٢. خارطة رقم: ١٢ لبلخي.

٣. تقرير ولاية الموصل، ص٦٨.

٤. بڕوانە: خارطة رقم: ١٣ –العراق في الخوارط القديمة.

PDF 4 KURD

ح- لە نەخشەی (ژ:١)ـی کتێبی گەڕیدەی بە ناوبانگی بەریتانی (کی لیسترنگ ١٨٥٤. ١٩٣٣) لە (اقالیم اسیة الجنوبیة الغربیة في ایام الخلافة العباسیة) عێڕاق لە خوارووی بەغدا دیاریکراوە، لە نەخشەی (ژ:٢) سنووری ئیقلیم جەزیرە و عێڕاقی دیاریکردوە گوزارشت لە سەردەمی عباسی دەکا، سنووری سەرووی عێڕاق دەگاتە هێڵی: حەدیسە*، تکریت خوارووی داقووق... لە نەخشەی (ژ:٥) بە ڕوونی هەردوو نەخشەی کوردستان و هەرێمی عێڕاقی بە جیا دیاریکردوە، بەڵام لێرە عێڕاقی عەجمی و عەرەبیەکەی دیاری نەکردوە.

خ- لە هەردوو نەخشەی ئیداری بەشی ئاسیای عوسمانی (١٨٩٣) و (١٨٩٦) عێڕاق لە خوارووی بەغدایە.

د- لە نەخشەی سایکس پیکۆی (١٩١٦) تەنها بەغدا و بەسرەی بە میزۆپۆتامیای خواروو (عێڕاق) دیاریکرد.

٧. فراوانترین سنووری عێڕاق: لە (معجم ما استعجم): "العراق هو مابین هیت الی السند و الصین الی الري خراسان الی الدلیم و الجبال و اصبهان"، ئەوە فراوانترین نەخشەی عێڕاقی عەجەمە، هەر لە نەخشەی ئیبن حۆقل تا نەخشەکانی عوسمانی[١] موعجەم و کتێبە مێژووییەکان هەموی خوارووی کووفە تا نزیک بەسرە بە عێڕاقی عەرەبی دەناسن، بەڵام بابزانین

---

* - (حەدیسە)یەکی تر لەو سەردەمی لەسەر ئەو نەخشەیە و هەندێ نەخشەی تر لە شوێنی ئیستای گوێڕ دەبینرێ، هەرچی ئەو حدیسەیەی لە سەروودا هاتووە ئەو حەدیسەیەی ئێستایە کە کەوتۆتە ڕۆژئاوای بەغدا.

١. بڕوانە نەخشەی ئیبن حۆقەل لە ساڵی (٩٧٧ز) هەروەها نەخشەی عوسمانی (١٨٩٣) و نەخشەی (١٨٩٦).

PDF 4 KURD

فراوانترین نەخشەی عێراق کە باس کرابی د.ئەحمەد سوسە گەڕاوە لەنێو ئەو هەزاران نەخشە هەرە فراوانترینەکانی لە کتێبەکی بەناوی (العراق في الخوارط القديمة) کۆکردۆتەوە، لەو نەخشانە وەک لە (آثار البلاد و أخبار العباد) و (عجائب البلدان)دا هاتووە: سنووری عێراق بریتیە لە عەبادان تا تکريت و نزيک موسڵ، دەبێ تێبینی بکرێت ئەو سنوورە فراوانە بۆ عێراقی عەرەبی نییە بەڵکو ئەو ناسنامە وردەی دیاری نەکردوە هەر گوتوویەتی عێراق، ئیتر لەو کاتیەوە ئەوانەی ئەو زانیارەیان سەبارەت بە سنووری سەرووی عێراق دیاریکردوە ئەوەیان لێک نەکردۆتەوە عێراقی عەرەبی یان عەجەمی هەروەک لە دواییش بەریتانیا لە کێشەی ویلایەتی موسڵ پەیڕەویکرد، سەرەڕای ئەوەش لە دۆخە هەرە فراوانەکەی لە خوار (جەبەل حەمرین) سنووری عێڕاقە، ئەوە لەگەڵ تەقویمی عوسمانی ساڵی (١٧٠٠) وا دێتەوە کە ئەوکاتیش هەر موسڵ سەر بە حکومەتی دیاربەکر و بەغدا و بەسرەشی خستبووە سەر میزۆپۆتامیای خواروو، موسڵ لە کۆنەوە سەر بە دیاربەکر بووە[1]، قەزوينيش لە باسی دیاربەکر دەڵێ موسڵ شارۆچکەیەکە سەر بە دیاربەکرە[2].

یاقووتی حەمەوی (١١٧٨ز) لە معجم البلدان لاپەرە (٢٩٠)دا لە زۆر شوێن باس لەو سنوورە دەکا بە بۆنەی جیاجیا، لە باسی (حەلوان و هەبوونی شاهەنجیر لێی) دەڵێ: حەلوان دواسنوورە لە سەواد و عێراق کەمێک سەرووی بەغدایە کە بە هەرێمی شاخ ناودەبرێن، لە کتێبە کۆنەکان

---

١. ابن خلكان، وفيات الأعيان، ج٣، ص٢٤٠، هەروەها العراق في التاريخ، ص٥٤٨-٥٤٩، مظفرالدين كوكبري، ص١٣٢-١٣٤.

٢. القزويني، آثار البلاد و اخبار العباد، ص٣٦٨.

عێراق لەسەر عەرب پۆلێن نەکراوە، هەمووشیان لەگەڵ بروسکەکەی چەرچڵ تێکدەکەنەوە کە سوپای بەریتانی گەیشتە سەرووی بەغدا داوای لێکردن بوەستن و گوتی خوارووی جەبەل حەمرین بە سەرووەوە سنووری کوردستانە[1]، ئیتر باس لەوە کە کوردستانی خواروو بەشێک بێت لە عێراق نەک هەر دەشێ و ناشێ بەڵکو هەرێمیشیان لێکتر جیابووە[2].

٨. سنووری عێراق بە پێی سنووری ئیدارەی سەرووی ویلایەتی بەغدا. "بغداد: و يشمل (١١) قضاءا و هي: الكاظمية، العزيزية، العانة، الدليم، الكوت، الجزيرة، مندلي، خانقين، بدرة، جسان، سامراء[3]، بە پێی (وفيات الاعيان) و سەرچاوەی تریش لە سەردەمی مەغۆلەکانیشدا بەشی ئیداریەکەی ئەو ناوچەیە وەک خۆی بوو بە شێوەیەک کە سنووری سەرووی ویلایەتی بەغدا تا تکریت بووە، موسڵیش سەر بە دیاربەکر بووە[4]، قەزوینییش لە باسی دیاربەکر دەڵێ موسڵ شارۆچکەیەکە سەر بە دیاربەکرە[5].

٩. سنووری عێراق لە سەردەمی عەباسی و عوسمانی.. لە سەردەمی عەباسی هەندێ جار بە ویلایەتی کوفە گوتراوە عێراق، دوای کە پایەتەخت بووە بەغدا ئەوا ئەویش بووە ویلایەت، سنوورەکەی دەگەیشتە سامەڕا، لە سەردەمی عوسمانیدا عێراق ویلایەت نەبووە، بۆیە ناوی

---

١. الإسلام و العلمانية و أثرهما في نشأة الدولة العراقية، ص٢١٨.
٢. (الموسوعة العربية العالمية.. مادة: علوم عند العرب و المسلمين) لە (ص١٣٠)ـی ئەو کتێبە ناوی ئیقلیمەکان و وڵاتانی تێدایە.
٣. بڕوانە: أحوال العراق في المشروطية.. المصدرالسابق، ملحق رقم (١)، ص٢٩٢، و ملحق رقم (٣)، ص٣٠٣-٣٠٢.
٤. ابن خلكان - وفيات الأعيان ج٣، ص٢٤٠، هەروەها العراق في التاريخ، ص٥٤٨-٥٤٩، مظفرالدين كوكبري، ص١٣٢-١٣٤.
٥. القزويني، آثار البلاد و اخبار العباد، ص٣٦٨.

PDF 4 KURD

عێراق لای خەڵکیش بزر بووە، باشترین بەڵگە (لە راپۆرتی ویلایەتی موسڵ) بە وردی باس لەوە دەکا کە ناوی عێراقیان هەر نەشبیستبوو.

١٠. سنووری عێراق لە رێککەوتنەکانی نێودەوڵەتی هاوچەرخ:

ا- لە رێککەوتنی ئەرزەرۆم: لە (١٨٢٣/٧/٢٨) بەسترا، پێکهاتووە لە (٧) بەش- لە بەشی یەکەم باس لە کوردستان دەکات و دەڵێ سنووری دەگاتە نزیک بەغدا.

ب- لە رێککەوتنی سایکس پیکۆ ی (١٩١٦) لە هەردوو ماددەی (١) و (٢) تێیدا سنووری سەرووی عێراق دیاریکراوە وەک لە نەخشەی سایکس پیکۆ دیاریکراوە هەردوو ویلایەتی بەغدا و بەسرەیە، ویلایەتی موسڵی لەگەڵدا نییە واتە ئەوناوچانەی کە ئێستا پێی دەگوترێ (المناطق المتنازع عليها) نەدەگرتەوە.

پ- لە رێککەوتنی سیڤەر سنووری عێراق بە پێی سنووری کوردستان لە ماددەکانی (٦٢ و٦٣ و ٦٤) دەکەوێتە پشت فورات و بە لێڵی لە ماددەی (٢٧) یش بەکراوەیی مایەوە.

١١. سنووری عێراق لە کاتی هێرشی بەریتانیا بۆ سەر عێراق:

أ- سنووری عێراق لە بروسکەی چەرچڵ - دەقی بروسکەکە بۆ مەلیک فەیسەڵ دەڵێ: ئێمە بەڵێنی پێکهێنانی دەوڵەتۆکەکی عەرەبیمان پێداية نەک ئیمپراتۆریەت بۆیە سنووری تۆ(جەبەل حەمرین)ـە لەوێرا بەسەرەوە کوردستانە. لە بەڵگەنامەیەکی تری بەریتانیا (fo71/16367) تیلگرام ژ:٦١٦ هەمان راستی دووبارەدەکاتەوە[١].

ب- لە یادەوەریەکانی رۆژی ١٤/ ٣/ ١٩١٥ لە لایەن سیەر ئەرسەر هێرتزل دەڵێ: کاتی سوپای بەریتانی سەرکەوتنی بەدەستهێنا و لە

---

١. بڕوانە: چارەنووسی فیدڕالی دوای دەرچوونی عێراق لە بەندی (٧).

PDF 4 KURD

(١٩١٧) بەغـــدای گـــرت بـــەرەو ســـەروو چـــوو، بەبروســـکە ئاگادارمانکردنـەوە کـە لـە (جبـال حمـرین) نەپەڕنـەوە بـا تووشـی ڕووبەڕووبوونەوە نەبن لەگەڵ کورد[1].

١١. سـنووری عێراقـی سـەروو لـە دوای دروسـتبوونی تـا سـاڵی (١٩٢٥) لـە (١٠) لیـوا و (٣٥) قـەزا و (٨٥) ناحیـە پێکهـاتبوو[2]. واتـە ئـەو ناوچانەی کوردستانی بە کەرکووکیشەوە نەدەگرتەوە.

لـەوەی سـەروو بـەڕوونـی بۆمـان دەردەکـەوێ سـنووری سـەرووی عێراق لە باشترین دۆخیدا، لەو دۆخەی کە عێراقی عەرەبی و عەجـەمیش تێکەڵکراوە ئینجا گەیشتۆتە تکریت و خوارووی چیای حەمرین.

## هەڵەیەکی کوشندە پێویستە ڕاست بکرێتەوە:

دووبـارە لـەوەی سـەروو بۆمـان دەردەکـەوێ کـە مێژووی سیاسـی عێراق لە ساڵی (١٩٢٠) بەدواوە دەستپێدەکا، واتـە لـە پێش ئـەو مێژووە عێراق نە دەوڵەت بووە نە ئیمپراتۆریەتێک، لە سەردەمەکانی عوسمانی و بـوەیهی و فارسـی و مـەمالیک، ویلایـەتیش نـەبووە، تـەنها لـە سـەردەمی عەباسی ویلایەت بووە، شـاری بەغداش پایەتـەختی عەباسـی بـووە نـەک عێراق، زۆربـەی مێژونووسـەکان بـە پێـی بـارودۆخی یاسـایی و سیاسـی ئێسـتا باسـی بـارودۆخی ئیـداری و سیاسـی بەغـدای ئەوسـا بـە عێـراق دەکەن، ئەوەش هەڵەیەکی کوشندەیە.

---

1 .Briton Cooper Bush, Britain, India and Arabs, P.40; and Marian Kent, Oil and Empire, P.120.

٢. بڕوانـە: أ-العـراق فـي التـاريخ... المصـدر السـابق، ص٦٦٧ ب- موسـوعة العـراق السياسية...، ص٤١١.

PDF 4 KURD

لەلایەکی تر زۆربەی نووسەر و مێژوونووس و سیاسەتمەداران بە پێی واقیعی ئێستای عێراق وێنەی مێژووی ئەو ناوچەیە دەکێشن و پەرەگرافی وا بەرچاو دەکەوێ: (عێراق لە سەردەمی عوسمانی پێکهاتبوو لە سێ ویلایەتی موسڵ و بەغدا و بەسرە)، (هێرشی ئەسکەندەر بۆ سەر عێراق)، [هێرشی بەریتانیا لە (١٩١٤) بۆ سەر عێراق]، (هێرشی سەفەوی بۆ سەر عێراق)، (باری سیاسی عێراق لە سەردەمی میدیەکان)، (کورد لە ململانێی نێوان عێراق و بەریتانیا)...

هەموو ئەو دەستەواژانە هەڵە و چەوتن، ئەوە مانای ئەوە دەدا کە عێراق لە پێش ساڵی (١٩٢٠)ـەوە کیانی سیاسی و ئیداری و سنووری جوگرافی ئێستای هەبێ، کە نیەتی، بەشێک لە عروبیە شۆڤێنیەکان بە مەبەست ئەو کارە دەکەن، بۆ ئەو مەبەستەش پەنایان بۆ تەزویریش بردوە، زۆربەی هەرەزۆری ئەو بەڵگەنامانەش پێش (١٩٢٠) ئەو ناوچەیان بە ناوی تری وەک میزۆپۆتامیا و بیلاد ڕافدێن و.. ناوبردوە، ئەگەر کۆنتریش بێت بەناوی بیلاد ئاشور، بیلاد بابل.. کەچی هەرچی ناوی میزۆپۆتامیایە کردوویانەتە عێراق، لە ماددەی (١) و (٢)ـی ڕێککەوتنامەی (سایکس- بیکۆ) ناوی عێراقی تێدا نەهاتووە، بەڵکو پیتی (B) بۆ ئەو ناوچەیەی ئێستا بەشێکی (ناوچە دابڕاوەکانە) لەگەڵ ناوچەی (سووری) ویلایەتی بەغدا و بەسرە.. لە تەرجەمەی عەرەبی (الداخلية العراقية)ی بۆ زیادکراوە... بە کورتی ناوی عێراق لەو بەڵگەنامە مێژوویی و دیکۆمێنت و ڕێککەوتنامانەدا نەهاتووە تا ساڵی (١٩٢٣) بۆ یەکەم جار لە ماددەی (٣)ی لۆزان دوو جار ناوی عێراق هاتووە.

### زیانی نیشتمانی لەو هەڵەیە:

ئـەوە هـەر هەڵەیـەکی ئـەکادیمی و مێژوویـی سـادە نییـە، بـەڵکو ئارەزومەندانە بێت یاخود نا ئەوا مەبەستەکانی زۆر ترسناکە، وێنەیەکی سیاسـی و یاسـایی و دەروونـی وا دەدا کـە ئـەو عێراقـە بـەو شـێوەی ئێستای زۆر کۆن و ڕەسـەن بێت، ئیتر کوردستانی خواروو سـەر بەو عێراقە بووە، ئەگەر وابێت ئیتر تازە بە تازە کورد چی دەوێت، مانای فیدراڵی و ناوچە دابڕاوەکان و... هیچ بنەمایەکی نامێنێت، زیاتر لەوەوە سەرچاوەی تۆمەتەکانی وەک (کورد گێرەشێوێنن، دەستکردن، ئیسرائیل و ڕۆژئاوا دەیانجوڵێنن) ساناتر وەردەگیری و جورئەت بە هەندێ زانای ئاینی دەمارگیری عەرەبی داوە فتوای دژ بەفیدراڵی و مافی چارەنووسی کورد بدا، ئـەو کـاتی وا دێتـە بـەر چاوکـە کـورد کێشـەیە (مشـكلة) وەک دەڵێن (مشكلة الكردية)..

ئـەوەی جێی سـەرنجە لـە پرۆگرامـی بـاڵای کوردستانیش ئـەو هەڵـە کوشندەیە پیادەدەکرێ و بۆتە بەشێک لە ڕاستی مێژوویی لای زۆربەی ئەکادیمی و سیاسەتمەدارانی کوردستان چ جای عەوامی خەڵک.

ڕاستیەکەی ئەوەیە: لە چوارچێوەی پرۆژەی ئیمپریالی و ئیسرائیلی (ئەوانەی لە فەلەکی ئەوانەش دەخولێنەوە) ناوچەی ڕۆژهەڵات دابەشکرا، عەرەب بۆ (٢٢) پارچە، کوردستان بۆ (٥) پارچە، ئـەو سنوورانەش بە دەستکردی دروستکراون، سنووری عێراقی (هەردوو عێراق) لە مێژوودا یان نەبووە یان گوزارشتێکی جوگرافی هەبووبی کەمێک لەسەرووی بەغدا تا نزیک تکریت هەبووە. لە ساڵی (١٩٢٥) کوردستانی خواروش بە

PDF 4 KURD

عێراقـی دەسـتکرد لکـاوە، کەواتـە کێشـەکان و سـنوورەکان ڕوون و ئاشکران.. بزر نییە لە زەلکاوی مێژوو!!.

لەسـەر ئـەو بنچینـەی سـەروو، پاڵپشـت بـە دیـاریکردنی سـنووری سەرووی عێراق کە لەسەرەوە تۆمارمانکرد، ئـەوا دیـاریکردنی سـنووری خـواروی کوردستانیشـە، یـاخود سـنووری خـوارووی ناوچـە دابڕاوەکانـە، پرسـەکە زۆر ئاسـاندەکا بـۆ هـەر حـوکمێکی زانسـتی یـان سیاسـی و یاسایی ئینجا ویژدانی و حەقبێژیش.

**بەرەو ساغکردنەوە**

**<u>ویلایەتی (شارەزوور و موسڵ) کوردستانیە یان عێراقی</u>**

سـەرەتای موسـڵ وەسـفی بـە چەنـد ئـاوەدانی و ژیـارێکی سـەرەتایی هـاتووە، پاشـان ئەردەشـێر نـاوی فـەرمی لێنـا هـەروەک یـاقووتی حەمـەوی (١١٧٨ز) دەڵێ یەکەم جار ناوی موسڵ (نوئەردەشێر) بوو[١]، ئەردەشـێریش بە پێی نامەکەی (ئـەردەوانی پێنجـەم) کـورد بـووە[٢]، بۆیـە سـەرەتای نـاوی موسڵ ناوێکی کوردی بووە، لە ڕاستیدا سەرەتای زۆربەی شارەکانی ئـەو ناوچەیـەی (ئێسـتا پێـی دەوتـری عێـراق) عەجـەمی بـووە، بابـل لـە بـاڤیلی کـوڕی کیسـڕا هـاتووە، بەغـدا لـە بـاخی داد هـاتووە، سـامرا لـە (سـام ڕا) هاتووە، حەدیسە لە بنەچەدا ناوی (نۆگرد) بـووە، لـە دوای ئەمەویـەوە ئـەو ناوانە تەعریب کراون، لە ڕاستیدا بە مەبەسـتی تـەعریب نـەبووە، وەک لـەو

---

١. معجم البلدان- ج٥، ص٢٢٤.

٢. إذ ورد عليه رسول الأردوان (ئۆردوانی پێنجەم) بكتاب منه فجمع أردشير الناس لذلك و قرأ الكتاب بحضرتهم فإذا <u>فيه إنك قد عدوت گورك و اجتلبت حتفك أيها الكردي المربي في خيام الاكراد</u>... (تاريخ الطبري).

سەردەمە ئەو مانایە وەردەگری، زیاتر مانای بەئیسلامیکردنی ناوەکان بووە هەروەک بە ئیسلامیکردنی ناوی کەسەکانیش بە تەرازووی ئێستا مانای تەعریب وەردەگری، لەو چوارچێوەیەدا ناوی نۆئەردەشێریش گۆڕا بۆ (موصل)، بەمانای پێکگەیاندنی دووهەرێمی جیا (هەرێمی جەزیرە) و (هەرێمی عێراقی عەجەمی)[1]، هەندێکیش دەڵێن (موصل) نییە، بەڵکو (موسیلا)یە هەروەک زەینەفۆنیش وای ناوبردوە، ئەوەی ئەو ڕایە بە هێز دەکا لەو سەردەمی ناوی عەرەبی خۆی هەبووە بەناوی(حۆلان) وەک مەقدەسی و (کی لیسترنگ) وا دەڵێن[2]، ناوە ئارامیەکەشی (عبوریا) بووە، بەو پێیە بێت موسیلای کوردی بووە دوای عەرەب بە موصل دەریانبڕیوە، ئەوەی شارەزای تەعریبی ناوی شار و ناوچە و میللەتان بێ لە ناخی نووسەرە ئیسلامیەکان بە مەبەستی پیرۆزکردنیان (نەک تەعریبی ئێستا) زیاتر ئەو ڕایەی لا پتەو دەبی، هەروەک ناوی گریناداش لە ئیسپانیا بووە غرناطە، ئامێدی بووە عمادیة، (نۆ گرد) کرایە (حديثة).. بە پێی هەندێ سەرچاوە لەوانە (ابن الفقيه) یەکەم عەرەب کە هاتە موسڵ ناوی (هرثمة بن عرفجة البارقي) بووە کە لەگەڵ (عتبة بن فرقد) هاتبوو[3].

مێژووی ئیداری زۆر کۆن نییە لە ساڵی (١٨٧٩ز) ویلایەتی شارەزوور گواسترایەوە بۆ موسڵ، لە سەردەمی عەباسی سنووری سەرووی ویلایەتی عێراقی دەگەیشتە سامەڕا و تکریت، لەوێڕا بە سەروو بە پێی قۆناغەکانی مێژوو سنووری خواروی ویلایەتی شارەزوور یان

---

١. یاقوت حموي، معجم البلدان، ج٥، ص٢٢٤.

٢. كي ليسترنك، بلدان الخلافة الشرقية، ص١١٦.

٣. لەو بارەیەوە توێژینەوەیەکی وردیی سلێمان ئەبو کاشخ بخوێنەوە بەناوی (حقيقه وجود الكردي في الموصل).

PDF 4 KURD

ویلایەتی دیاربەکر یان ویلایەتی جەزیرە یان (ویلایەتی موسڵ لەو دواییە) بووە، هەرچیەک بێت لە ڕووی ئیداری بەڵام هەرگیزا و هەرگیز لە ڕووی ناسنامەی نیشتمانی سەر بە عێراق نەبووە هەر سەر بە کوردستان بووە، هەروەک لە ڕێککەوتننامەکانی ئەرزەڕۆم و سایکس بیکۆ و سان ڕیمۆ و سیڤەر، باشترین و ڕوونترین بەڵگە هەردوو نەخشەی(١٨٩٣) و (١٨٩٦)ی عوسمانی- ئیداری بەشی ئاسیای ویلایەتەکانی عوسمانیە، ئینجا ڕاپۆرتی لیژنەی (عصبة الأمم) سەبارەت بە ویلایەتی موسڵەوە بەڕوونی ویلایەتی موسڵ وەک بەشێک لە کوردستان گوزارشتکراوە، کە دەڵێت: ئەگەر بەڵگەکە ڕەگەزی بێت ئەوە پێویستە یەکسەر دەوڵەتێکی کوردی لە ویلایەتی موسڵ پێک بهێنین چونکە ٨/٥ی خەڵکەکەی کوردن[١]، ئەوە لە کاتێکدایە کە نوێنەری کورد لەو کێشەیە نەبووە و لە دوایشدا ئەندامانی ئەو لیژنەیە لە نووسینەوەی یاداشتەکانیانە باسیان لەوە کردوە کە قەناعەتی تەواویان بە تورکیا وبەریتانیا نەبووە و کورد لەو ڕاپۆرتە بەشخوراو کراوە، کوردستان هەر ویلایەتی موسڵ نەبووە، ویلایەتەکانی ئامەد، بەشێک لە ویلایەتی شام، کوردستان بوونە، بۆیەش هەندێ جار لە ئاستی ویلایەت بەرزتر بووە بۆ ئاستی ئیالەت[٢]..

ویلایەتی موسڵ سەر بە ویلایەتی بەغدا نەبووە، یان سەربەخۆ بووە وەک لە دوای ساڵانی (١٨٧٩)، زیاتر لەگەڵ جەزیرە و دیاربەکر هەرێمیان پێکهێناوە، لە دائیرەی مەعارفی فەرەنسی دەڵێ جەزیرە و موسڵ و کەرکووک و هەولێر و سلێمانی و ڕانیە و کفری یەک یەکە

---

١. بەشی (استنتاج ولاية الموصل)، ص١٥٤.

٢. گەشتەکەی (ئەسفەهانی بۆ شنۆ و ڕەواندوز) لە فارسیەکەی بە ئیالەتی کوردستانی ناوبردوە.

پێکدەهینن، هەرچی لە ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵە ئەویش دەڵێ: موسڵ و کفری و کەرکووک و ئەربیل (هەولێر) و سلێمانی و ڕانیە یەک یەکەن[1]، لە (عجائب البلدان، سراج الدین ابن الوردی – مادە: أرض الجزیرة): ڕوونتر بۆی هاتووە و دەڵێ: أرض الجزیرة هي جزیرة ابن عمر، و تشتمل علی دیار ربیعة و مضر، و تسمی دیار بکر، و هي ما بین دجلة و الفرات و کلها تسمی بالجزیرة، و بها مدن و قری عامرة. و من مدنها المشهورە الموصل. لە موعجەمە کۆنەکانیش کە زاراوەی (موصلان) هاتبی مانای موسڵ و جەزیرەی وەرگرتوە[2]، بە پێی (ابن خلکان ١١١٢-١٢٨٢) زۆر زانای تریش لە سەردەمی مەغۆلەکانیشدا بەشی ئیداریەکەی ئەو ناوچەیە وەک خۆی بوو بە شێوەیەک کە سنووری ویلایەتی بەغدا تا تکریت بووە، موسڵیش سەر بە دیاربەکر بووە[3] تەقویمی عوسمانی ساڵی (١٧٠٠) وادێتەوە کە ئەو کاتیش بەغدا و بەسرەی خستبووە سەر میزۆپۆتامیای خواروو موسڵ هەر سەر بەحکومەتی دیاربەکر بوو[4]، قەزوینییش لە باسی دیاربەکر دەڵێ موسڵ شارۆچکەیەکە سەر بە دیاربەکرە. تەنانەت سەنگ و کیلۆ و دراویشیان لەگەڵ بەغدا لێکتر جیابووە[5].

---

١. تقریر ولایة الموصل، ص٧٧.

٢. یاقوت حموی، معجم البلدان، ج٥، ص٢٢٤.

٣. ابن خلکان، وفیات الأعیان، ج٣، ص٢٤٠، هەروەها (العراق في التاریخ، ص٥٤٨-٥٤٩)، مظفرالدین کوکبري، ص١٣٢-١٣٤.

٤. القزویني، آثار البلاد و اخبار العباد، ص٣٦٨.

٥. حنا بطاطو، العراق، ج١، ص٣٥ (یەک تەغار لە بەغداد= ٢٠٠٠ کگم، کەچی لە بەسرە= ١٥٣٨کگم، لە موسڵیش جیابووە بەڵام دیاری نەکردبوو).

PDF 4 KURD

حزبی ویلایەتی موسڵ هەبووە لەنێو عەرەبەکان بە ناوی (جمعیە الدفاع الوطني عن ولایة الموصل)[1] بە پێی ماددەی (٢ و ٣ و ٤)ـی پەیڕەوی ناوخۆی مەرجی بە ئەندامبوون ئەوە بوو کە دانیشتوی ویلایەتی موسڵ بێت، لە یاسای عوسمانی جیاوازیەکی ڕوون لە نێوان ویلایەتی بەغدا و موسڵدا هەبووە وەک (غاربیت) لە وەزارەتی هیند بە وردی تێبینیکردبوو[2].

کە جارجار لە کاتی ئاڵۆزی ئەو ئاڵوگۆڕیە هەبووە، جار وابووە ویلایەتی موسڵ خراوەتە سەر بەغدا، جاریش وابووە بە پێچەوانە.. ئەوە لە زۆربەی ویلایەتە دراوسێکان کراوە، تەنها لە نێوان موسڵ و بەغدا نەبووە و وەک لە لایەن عروبیە ناسیۆنالیزمیەکان کراوەتە پاساو بۆ ئەوەی کوردستانی خواروو سەر بە عێراق بووە. گەلێ جاری تریش کورد زاڵبوونە بەسەر بەغدا و لە کوردستان والی بۆ دیاریکراوە، وەک لە سەردەمی عەبدولڕەحمان پاشای بابان، مزەفەرەدین و. زولفیقار و محەمەد پاشای کۆرە، هەر بۆیەش دەبینین (فۆرستەر) لە کتێبەکەی (نشأة الدولة العراقية، ص١٠٨) دەڵێ لە ساڵی (١٩١٧) و (١٩١٨) بەریتانیا هەوڵیدا ئەو جیاوازیانەی نێوان ویلایەتی موسڵ و بەغدا هەڵگری بۆ یەکخستنیان، سەرەڕای ئەوانەش گرنگی سیاسی و ئیداری بەغدای ئەوسا پەیوەندیی بە عێراقەوە نەبووە، لە دوای عەباسییش بە دەگمەن نەبێ حوکمی عەرەبی لە بەغدا نەبووە، نزیکەی (٣٠) جار بەغدا بە سانایی داگیرکراوە، هەروەک لە ڕۆژی وەرگیرانی عێراق لە (عوسبە) لە

---

١. ئەو جمعیەیە لە موسڵ دروستبوو بە سەرۆکایەتی ئەحمەد فەخری لە دوای (١٩٢٠ز).

٢. د. سعد بشير اسكندر، سياسة البريطانيا العظمى تجاه كردستان، ص٢٠١.

PDF 4 KURD

(٣ تشرینی یەکەم/١٩٣٢)، سەرۆکی (جمعية العصبة) مسیو بۆلتس ئەوەی ئاشکرا کرد و گوتی: (إن العراق تحرر من السيطرة الأجنبية منذ عديد من القرون و بإمكانه تجديد أمجاد بابل و نينوى)[١].

عێراقی عەرەبی و ویلایەتی موسڵ زۆر لێکتر دووربوونە، بەڵام کە دەڵێن عێراق (بە تێکەڵی عێراقی عەجەمی و عەرەبی) ئەوا سنووریان لەسەر یەکتر بووە، بۆیەش یەکێک لە چوار دەرگەکانی موسڵ ناوی عێراق بووە، ئینجا ناوەکەشی (موسڵ) بەمانای پێکگەیاندنی هەردوو هەرێمی جەزیرە و عێراق[٢]، راپۆرتی لێژنەی ویلایەتی موسڵ پانۆرامای رای گەڕیدە و مێژوونووس و نەخشەساز و موعجەمە کۆن و نوێیەکانی تێدابوو، ئەوان دەڵێن خەڵکی موسڵ ناوی عێراقیان هەر نەبیستبوو، تەنانەت ناوچەکانی خواروو هەتا بەغداش، بۆیە دەبینین لە رێککەوتنامەی سایکس بیکۆ بەشی سەرەوەی بەغدا بە پیتی (B) دیاریکرا، ناوچەی بەغداش بە رەنگی سوور، ئەوە بەڵگەیە کە ناوی عێراق گوزارشتی لە سنوورێکی سیاسی و جوگرافی نەکردوە، بۆیە ئەو پیت و رەنگانە بەکارهاتووە، راپۆرتەکە دەڵێت هەرگیز لەژێر حوکمی عێراقی یان عەرەبی نەبووە، رەنگە لایەنی بەرامبەر بڵێت ئێ خۆ لە راپۆرتەکە نەیگوتبوو موسڵ لەژێر حوکمی کوردستانی بووە، لە راستیدا ئەو لێژنەیە نەهاتبوو بۆ ساغکردنەوەی کوردستانیبوون و عێراقیبوونی ویلایەتی موسڵ، بەڵکو بۆ ساغکردنەوەی تورکی یان عێراقی بوو، عەرەبی موسڵ سۆزی عێراقییان نەبووە هەتا لە سەردەمی دروستبوونی دەوڵەتی عێراق، هەر لە راپۆرتەکە باس لەوە دەکا خۆپیشاندانیانکرد و داوای گەڕانەوەی موسڵیان کرد بۆ سەر عوسمانی

---

١. فورستر، ج٢، ص٤٨٢.

٢. بڕوانە: معجم البلدان، مادة: موصل.

PDF 4 KURD

نەک عێراقی، تەنانەت داواکردنی ویلایەتی موسڵیش هەر لە لای بەریتانیا بووە نەک دەوڵەتی عێراقی، لە ڕێککەوتنی سایکس بیکۆ (١٩١٦) تەنها بەشێک لە ویلایەتی بەغدا و بەسرە ئامادەکران بۆ دەوڵەتێکی عەرەبی بە پێی مادده (١) و (٢)ی ئەو ڕێککەوتنە، ویلایەتی موسڵ درا بە فەرەنسا، دوای لە کۆنگرەی سان ڕیمۆ بەریتانیا لە چوارچێوەی سەودایەک ویلایەتی موسڵی لە فەرەنسا وەرگرتەوە، لە کاتی کێشەکەی ویلایەتی موسڵ، نوری سەعیدی سەرۆک وەزیری ئەوکاتی عێراق پێشنیاری کرد بە بڕی بڕ(٥٠٠.٠٠٠ لیرەی ئیسترلینی) ویلایەتی موسڵ لە تورکیا بکڕێت[1]، ئەوەش باشترین بەڵگەیە کە ویلایەتی موسڵ عێراقی نەبووە.

کەواتە ئەو نەخشە سیاسی و ئیدارییەی عوسمانیساڵی (١٨٩٣) گوزارشت لە ڕاستی مێژوویی و جوگرافی دەکا کە تەواوی ویلایەتی موسڵی خستبووە سەر کوردستان و ئیتر بە پێی هەموو بەڵگەکان ویلایەتی موسڵ ناسنامەیەکی نیشتمانی ڕوونی کوردستانی هەیە، بە دەنگی کوردیش ئەو ویلایەتە گەڕایەوە سەر عێراق ئەگینا عەرەب و تورکمان ئەو کاتی جۆرە ڕەئیەکی پێچەوانەیان هەبوو.

## ڕەهەندێ کوردستانی لە ویلایەتی موسڵ:

دەرکەوت ناسنامەی مێژوویی ویلایەتی موسڵ دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان، دوای لە ڕووی ئیداری و سیاسیش بەرجەستەکرا بە هۆی ڕێککەوتنی بەدلیسی سوڵتان، لە سەردەمی سوڵتان موڕادی سێیەم بە فەرمی لە (١٥٨٣) میرنشینی ئەردەلان کەوتۆتە سەر ویلایەتی

---

١. تاريخ الوزارات العراقية، ج١، ص٢٨١.. ئەوکات کڕینی هەرێم و ویلایات باوبووە.

شارەزوور، لە ساڵی (١٦٩١) پایەتەختی ئەردەلان لە زەڵم گوازرایەوە بۆ کەرکووک، ئیبن خەلەکان لە کتێبی دەڵێ: لە سەردەمی سەرەتای ئیسلامەوە هەرناوی کەرکووک ڕاستەوخۆ بەندبووە بە (بلاد شهرزور)، هەروەها دەڵێ کەرکووک مەڵبەندی شارەزوور و زۆر میرنشینی کوردی لەوێ بووە[١]، ئەوە بەڵگە نەویستە کە باسی شارەزوور کرابێ مەبەست کەرکووکە، لە (نظام إدارة الولايات)ی عوسمانی کەرکووک بە فەرمی بە شارەزوور تۆمارکرابوو[٢]، بۆیە ناوی کەرکووک نابینی لە مێژوو[٣]، تەنانەت لە شیعری تورکی ناوی کەرکووک بە شارەزوور هاتووە: ئەوەتا شاعیر سافی بە بۆنەی هاتنی چاپ لە (١٢٩٦ک) بۆ کەرکووک ئەو شیعرە پێشکەش بە والی دەکا بۆ ئەو چاکەیەی و دەڵێ:

بنده سی صافی تشکر له دیدی تاریخنی
مطبعه بوییلده شهرزور ده اولدی کشاد

دوای کە لائیکی زاڵ بوو بەسەر عوسمانی لە نێوان ساڵانی (١٨٢٦-١٨٣٣) لە سەردەمی سوڵتان مەحموود بیری مەرکەزیەتی ئەڵمانی و فەڕەنسی هێنرا، لە (تشرینی دووەم/١٨٦٤) لەگەڵ دروستبوونی عوسمانیەی لاو فرمانی مەرکەزیش بۆ ویلایەتەکان دەرچوو، بەرەبەرە موسڵێشیان لەگەڵ شارەزوور کردە شریک، بۆ یەکەم جار والیەکی غەیرە کورد (محەممەد ئینجە بەیرەقداری تورک) لە (١٨٣٣ تا ١٨٣٥)

---

١. وفيات الأعيان، ص١٩٣.

٢. حوادث و وقائع كركوك منذ ١٧٠٠م حتى ١٩٥٨م.

٣. بەپێی هەندێ سەرچاوە یەکەم جار ناوی کەرکووک (بەو ناوە) لە (مزەفەرنامە)ی تەیموور لەنگ هاتوە لە سەرەتای سەدەی (٩).

PDF 4 KURD

بووه والی شارەزوور[1]، لە (١٨٧٩) مەدحەت پاشا بە پاڵپشت بە (نظام إدارة الولايات)ی نوێی عوسمانی لە چوارچێوەی مەرکەزیەت ویلایەتی شارەزوور هەڵوەشایەوە و هاتە سەر موسڵ، جارێکی تر لە (١٨٨٢) ویلایەت گەڕایەوە کەرکووک بە ناوی شارەزوور و موسڵ بۆوە سنجاقێکی شارەزوور، دوای جارێکی تر لە (١٨٨٦) (باب العالي) گەڕاندیەوە موسڵ. نافیعە فەندی[2] بووە والی موسڵ، لە (١٨٩٣/١٢/٢) لە لایەن جەواد پاشای (سەدرولئەعزەم) پێشنیارکرا بۆ سوڵتان عەبدولحەمید قایل بێت تا شارەزوور لاببرێت ناوی شارەزووریش گۆڕدرا بۆ کەرکووک.

ئیتر لەو کاتیەوە سەرەتای تەقەلای پاکتاوی ڕەگەزی لە ئیدارەی عوسمانی دەستپێیکرد کە ناوەڕۆکەکەی لە کێشەی ویلایەتی موسڵ دەردەکەوێ.

کێشەی ویلایەتی موسڵ بە پێی ماددەی (١) و (٢)ی کۆنگرەی لۆزانی (١٩٢٣) گێڕدرایەوە بۆ (عصبة الأمم)، لەوێش لە دانیشتنی (ژ:٣٠) لیژنەیەکی پسپۆڕ پێکهات لە خەڵکی بێلایەن، ئەوانە زۆر بە

---

١. هەمان سەرچاوە.

٢. شێخ ڕەزای تاڵەبانی شیعرێکی لەوبارەیەوە هەیە بەتورکی:

موصل اولدی ولايت، نافع افندي والی
ويل لكم الرعيه، كول باشوه اهالی

واتە : هاوار بۆ خەڵکی ئەو ناوچە موسڵ بووە ویلایەت و نافعە فەندیش والی بێت.

واپێدەچی ئەو شیعرە کار و کاردانەوە بن دژ بەیەک لە گەڵ شاعری کەرکوکی عەبدوڵڵا سافی کە پێخۆشبوونی خۆی دەردەبڕێ: اشبو تاريخ اوقنور كوردم مقام اوجده هر گرف جوهرلو بر صورت ايله سنگور اوستنه

شهرزوری موصل حدبايه الحاق ايتديلر باق ايشه كم قويديلر قنبوری قنبور اوستنه..

وردی ناوچەکەیان پشکنی بەرەنجامێکی یاسایی گرنگیان بۆ دەرکەوت کە ئەو ناوچەیە نە عێراقیە و نە تورکی، عێراقی نەبوونەکەیمان باسکرد، دەمێنی تورکیاییەکەی:

لە ڕاستیدا ئەو ویلایەتە و (٣٢) ویلایەتی تر موڵکی عوسمانی بوون، بەڵام عوسمانی بە خواستی خۆی و دوو ساڵ لە دوای هودنەی مودرەسی (١٩١٨) برانەوەی جەنگ ئینجا نوێنەری سوڵتانی عوسمانی (هادی پاشا) چوو لە کۆنگرەی سیڤەری (١٩٢٠) بە پێی ماددەی (١٣٢) وازی لەو ناوچانە هێناوە، بە پێی ماددەی (٦٢)ش بۆ کوردستان، سەرەڕای ئەوەش ئەو موڵکەی عوسمانی نابێتە موڵکی تورکیا، چونکە هیچ بەڵگەیەکی یاسایی نییە کە تورکیا میراتگری یاسایی عوسمانی بێت، بە پێچەوانەوە دوژمنی یەکتر بوون و هەردەم تورکیا داکۆکی لەوە کردوە کە ئەو پەیوەندیی بە عوسمانی نییە و مۆری ڕێککەوتنامەکانی عوسمانی هەڵناگری، کەواتە ئەو ناوچەیە بە پێی ڕەوشی یاسایی و ڕاپۆرتی لیژنەی ویلایەتی موسڵیش نە تورکیاییە نە عێراقی، کەواتە ئەوەی خستیەوە سەر عێراق بەهۆی کوردستانیبوونی ویلایەتی موسڵ بوو، هەروەک لە ڕاپۆرتەکە دەڵێ ئەگەر توخمی نەتەوەیی بنچینەبی ئەوا (٨/٥)ی خەڵکەکەی کوردن حکومەتێکی کوردی شایستەی ویلایەتی موسڵە[١]، کەواتە ناوچە دابڕاوەکان بەهۆی کوردستانیبوونیان کەوتنەوە سەر عێراق ئەگینا عەرەبی موسڵ کەچاویان بە لیژنەی عوسبە کەوت هاواریانکرد بژی تورکیا[٢]، لە ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ باس لەوە دەکا کە عەرەب

---

١. لە بەشی (استنتاج ولاية الموصل)، ص١٥٤.

٢. وەک لە تقرير ولاية الموصل، ص٢٦.. باس لەو دیمەنەی عەرەب دەکا لە موسڵ.

PDF 4 KURD

هەستی نەتەوەیی زۆر لاوازە لەو ناوچەیە، کوردایەتی بەهێز بووە، ئەگەر عروبیش هەبووایە ئەوا ڕایان لەگەڵ تورکیا بووە نەک عێراق[1]، بۆیە ئەگەر بەسای عەرەب بووایە ئەو ویلایەتە نەدەخرایە سەر عێراق، هەروەک دۆڕاندنی ئەسکەندرونە بۆ تورکیا و فەڵەستنیش بۆ ئیسرائیل..

### سنووری خواروی ناوچە دابڕاوەکان:

سنووری خوارووی ناوچە دابڕاوەکان هەر هەمان سنووری خواروی کوردستانە لەو سەردەمە، هەرچەندە ئەگەر قووڵ ببینەوە بۆ مێژوو سنووری خواروی کوردستان ئەوە نییە ئەوەی ئێستای سنووری خواروی ناوچە دابڕاوەکانە، بەڵکو زۆر فراوانترە، خراپ نییە سنوورە فراوانەکەش باس بکەین بۆ ئەوەی ئەو سنوورەی ئێستای ناوچە دابڕاوەکان مسۆگەر بێت، ئەگەر سنووری خواروش دیاریکرا کە کوردستانیە، ناوچە دابڕاوەکانیش کەوتە ئەو سنوورە، ئەوا ئەو ناوچانە کوردستانی دەبێت بە پێی بەڵگەنامە مێژویی و جوگرافی و سیاسی و یاسایی و ڕەگەزی.. کە لە کۆتاییدا بەڵگەنامە نێودەوڵەتیەکان پێکدەهێنێت، ئەوەش هەنگاو بە هەنگاو بۆی دەچین جارێ لە پێشدا بزانین ئەو دوو ناوچەیە هەر پێکەوە بوونە یان لێکتر جیابوونە؟

### جیایی کوردستان و عێراقی عەرەبی:

هەرچەندە کوردستان و عێراقی عەرەبی سنووریان لەسەر یەکتر نەبووە تا یەکێکیان سەر بەوی تریان بێت، بەڵام بۆ زیاتر ساغبوونەوە، ئەو بەڵگانە تۆماردەکەین:

---

١. ولاية الموصل، ص٢٠٢-٢٠٣.

أ- جیاییان لە ناو و ڕەچەڵەکی جوگرافیدا: ئەو ناوچەیە و تەواوی کوردستانی ئێستا لە کۆندا سەر بە (اقلیم الجبال) و (بلاد الاکراد) و ویلایەتی شارەزوور و بەشێکی (عراق العجم) بووە، لە دوای گەشەی زاراوەی کوردستان لە ڕووی سیاسی ئەو ناوچەیە و زیاتریشی گرتۆتەوە، بەڵام لە ڕووی ئیداری سەر بە ویلایەتی موسڵ بووە لە دوای ساڵی (١٨٧٩).

ب- جیاییان لە ئینتمای هەرێمیدا: لە چوارچێوەی ئەو دابەشیەی جیهان بۆ (٧) هەرێم لە لایەن جوگرافیاناسەکانی کۆن[١]، ئەو ناوچەیە (کەرکووک و تاخوارووی موسڵ) و کوردستانی ئێستا سەر بە هەرێمی(٤) بووە، کەچی عێڕاقی عەرەبی سەر بە هەرێمی (٣) بووە.

پ- جیاییان لە هێڵ و بورجەکانەوە: کوردستان بەو ناوچەیەشەوە لە بورجی (گا -الثور)ـە کەچی عێڕاقی عەرەبی لە بورجی (دووپشک- عقرب)ـە، بەغداش لە بورجی (کەوان- قوس) بووە[٢]. کۆ ئۆردینەیتی گەردوونی کوردستان دیسان جیایە لەگەڵ عێڕاق و شوێنی تایبەتی خۆی هەیە بریتیە لە: درێژیی (٤١-٥١) پلە، پانیەکەشی (٣٠-٤٠) پلە، لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی عێڕاق (لەسەرەتای سەدەی بیستەم) نامەی سورەییا بدرخان بۆ سەرۆکی کۆنفرانسی ئاشتی سنووری خوارووی کوردستانی لەسەر هێڵی (٣٤) دیاریکردوە، سەرووش بۆ

---

١. بڕوانە: یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج١، هەروەها مقدمة ی ئیبن خەلدوون.. لە بنەچەدا ئەلبیرۆنی یەکەم جوگرافیناسی ئیسلامیە کە جیهانی دابەشکرد بۆ (٧) ئیقلیم، قەزوینی پلانی توێژینەوەی کتێبەکەی (آثار البلاد و اخبار العباد) لە سەر ئەو ٧ ئیقلیمە دارشتوە.

٢. بڕوانە: دابەشی ئیقلیم و بورجەکانی معجم البلدان، ج١.

هێڵی (٣٩)[١]، (فۆرستەر)یش هێڵی پانیی (٣٤)ی بۆ سنووری سەرووی عێراق دیاریکردوە[٢]، کەچی عێراق لە خوارووی هێڵی (٣٤) تا کەنداو.
بەوشێوەیە لە ئینتمای هەرێمی و مێژوویی و جوگرافی و پلەکانی سروشتی و گەردوونی و ..لێک جیابوونە.

ت- جیاییان لە ڕوانگەی جوگرافی ناسە ئیسلامیەکان: جوگرافیناسە بەناوبانگەکانی ئیسلامی وەک (بەلخی، ئێستاخاری، ئیبن حۆقەل، مەقدەسی..) جیهانی ئیسلامیان لە سەردەمی خەلافەت بۆ (٢٠) هەرێم دابەشکردبوو، کوردستان (بەو ناوچە ناکۆکانیشەوە) سەر بە ئیقلیم جیبال بووە، هەرچی عێراقی عەرەبیە سەر بە (ارض جزيرة) بووە[٣].

ج- جیاییان لەسەر نەخشە کۆنەکان: لە نەخشە بەناوبانگەکەی ئیبن حۆقەل (صورة الارض) بە ڕوونی (اقليم الجبال) و (مصايف الاكراد) لەگەڵ عێراق لێکجیان چ جای عێراقی عەرەبی.هەروەها لە نەخشەی ئیساک تیریۆنی هۆڵەندی کە لە ساڵی (١٧٩٠ز) کێشراوە، لەو نەخشەیەدا کوردستان لەگەڵ عێراقی عەرەبی بەجیا هاتووە. لە هەردوو نەخشەی عوسمانی بەشی ئاسیای ساڵانی (١٨٩٣ و ١٨٩٦)، جگە لەوانەش باقی نەخشەکان عێراقی عەرەبیان لەگەڵ کوردستان بە شێوەی هەرێمی جیبال یان جەزیرە لێک کردۆتەوە.

چ- جیاییان بە پێی یاسای نێودەوڵەتی: ئەو لێک جیاییە بەردەوام بووە لە سەردەمی عوسمانی و تا دابەشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش لە دوای

---

١. بەڵگەنامەی بەریتانی و فەرەنسی (ژ: ٢٣) لە کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردیەکان لە بەڵگەنامەی بەریتانی و فەرەنسی).
٢. فورستر، نشأة الدولة العراقية، ص١٣.
٣. بڕوانە: موسوعة العربية العالمية، مادة: العلوم عند العرب و المسلمين.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤– ١٩١٨)، کە بە پێی ڕێککەوتنامەی سیڤەر دابەشکران، لە کاتێکدا کوردستان بە پێی ماددەکانی (٦٣) جیابۆوە کەچی عێراق بە پێی ماددەی (٩٤) جیابۆوە[١]، وڵاتانی عەرەبییش هەریەکە بەماددەی جیاجیا جیابوینەوە. لە کۆنگرەکانی ئاشتی و سان ڕیمۆ و هەرە دوایش سیڤەر بۆ جیاکردنەوەی کوردستان بەڵێننامە لە تورکیا و عوسمانی وەرگیرا بە پێی ماددەی (٦٤) هیچ بەڵێننامەیەک لە عێراق وەرنەگیراوە بۆ سەربەخۆیی کوردستان، بەڵکو عێراق خۆشی پێویستی بە ڕازیبوونی عوسمانی بوو و بەوپێیە عێراقیش بە پێی ماددەی (١٣٢) ڕەزامەندی بۆ وەرگیرا، ئەوەش ڕوونترین بەڵگەی یاسایی نێو دەوڵەتیە کە کوردستان یان ویلایەتی موسڵ یان ناوچە ناکۆکەکانی ئێستا سەر بە عێراق نەبووینە.

ح- جیاییان لە سیستەمی ئینتداب: عێراق و سوریا و وڵاتانی تر پاڵێوراو بوون بۆ دەوڵەت لە ڕێی ئینتداب کە لە ماددەی (٢٢)ی کۆمەڵەی نەتەوەکان بە سێ پۆلی (A, B, C) دیاریکرابوو، عێراق لە پۆلی (A) بوو، بەڵام کوردستان لەبەر پێگەیشتنی و بوونی دەسەڵاتی سیاسی و هەرێمێکی دیاریکراو بە ناوی (کوردستان) هەروەک لە سیڤەریش بە ئەدریسێکی سەربەخۆ لە بەشی سێیەم هات بێ ئینتداب، سنوورەکەشی دیاربوو[*].. ئەوا پێویستی بە ئینتداب نەبووە.

---

١. سووریا و میزۆپۆتامیا (عێراق) بەپێی مادەکانی (٩٤ – ٩٧). ئیسرائیل.. بەپێی ماددەی (٩٥). حیجاز بەپێی ماددەکانی (٩٨–٩٩). بەو شێوەیە میسر لە مادەی (١٠١). سوودان لە مادەی (١١٣). مەغریب و تونس لە ماددەی (١١٨). لیبیا بە ماددەی (١٢١).

[*]- بێجگە لە فەرهەنگی وڵاتانی تر خودی فەرهەنگی ئیداری و سیاسیی کۆن و نوێی عوسمانی، دانیان بە کوردستان نابوو، سنووریشیان دیاریکردبوو.

PDF 4 KURD

خ- ڕوونتـرین جیـاوازیی نێـوان کوردسـتان و عێـراق لـه پرسـیارێکی ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ لاپەڕە (١٦٧) دەپرسی له چوارچێوەی ئەو (٣) پرسیارەی لیژنەکە بۆ بەریتانیا ناردوویەتی لـه پرسـیاری سێیەم هـاتووه ئایا لـه بـەریتانیا چەند بەڵگەنامـەی سـەبارەت بە بازرگانی نێوان کوردستان و عێراق هەیـە؟ واتـه ئەوەنده جیابووینه بـه دوای بەڵگـەنامـەی بازرگـانی گـەڕاون، واتـه جیاییـان ئەسـیله لکانـدنیان حاڵەتێکی تازه بووه.

د- جیاییان له مێژوو و جوگرافیا (واقعدا): لـه مێژوودا پێکەوه نەبووینه زیـاتر لـەوه لـه ڕووی جـوگرافیش سـنووریان لەسـەر یـەک نـەبووه بـەڵکو ئیقلیمـەکیان لـه نێوانـدا بـووه، بـۆ ئـەو مەبەسـته ڕوونتـرین نەخشەی کۆن که کوردستان و عێراقی عـەرەبی لەسـەر بێت بریتیـه لـه نەخشـەی حـەمدوڵلا بـن مسـتەوفـی (١٣٣٩ز) دەدەکـەوێت چـۆن هەرێمێکیان له نێواندایه.

هەنـدێک لـه نووسـەر و مێژوونووسـی کـوردی ئـەو جیاوازیانـه بـۆ ئـەودیوتر دەبـا و دەڵـێ ئێمـه و ئـەوان لـه ئـاو و هـەوا و گـل و جـۆری زەمین و ڕووەک و.. هەمووی لێکتر جیـاین[١] ئـەوەش لـەوه دێت کـه هـیچ متمانەیەک نەماوه دەیەوێ له شەڕی دوورکەوێتەوه، ئەگینا جیاوازی ئاو و هـەوا و ژینگـه و هۆکارەکـانی تـری جـوگرافی و جیۆلـۆجی ئەوەنـده پەیوەندی به نەژاد و توخم نییه وەک فەیلەسوفەکانی سەدەی (١٨ و ١٩)

---

١. بـۆ ئـەو مەبەسـته بڕوانـه: توێژینەوەیـەکی ورد و زۆر بـه پێـزی (عبـدالرقیب یوسـف، حدود کردسـتان الجنوبیة تاریخیـا و جغرافیـا) لـه لاپـەڕه (٢٠٤-٢١٠) تیایدا بەلای ئەو جۆره جیاوازیانەش چووه.

PDF 4 KURD

له فەڕەنسا وای بۆچووبوون، ئینجا ئێمە لەگەڵ عەرەب براین ئەگەر ئەو کێشانە چارەسەر بکرێت.

## کامیان ڕەسەنترە

تەقەلایەکی زۆر دراوە ناوی عێراق لە قووڵای مێژوو بدۆزرێتەوە، لە (العراق في الخوارط القديمة) پەنای بۆ کۆنترین نەخشەی سەر زەوی کە لە سەردەمی سەرگۆن (٢٣٠٠پ ز) بردوە، کەچی بە وردبوونەوەیەکی سادە لەو نەخشەیە[١] دەردەکەوێ ناوی عێراقی لەسەر نییە تەنها بابل و ئاشووری لەسەرە، کەچی بەشی (الجبال) لە سەرووی بابل و بیلاد ئاشوور دیاریکراوە. بەڵام ئەگەر کەمێک بیلاد ئاشوور بەو پلەیە بۆ عێراق ببێتە پاڵپشتی جوگرافی بۆ ڕەسەنەیاتی ئەوا (جبال) دە هێندە دەبێتە پاڵپشت بۆ کوردستان، چونکە عێراق زادەی چالاکی زێدی باپیرانی عەجەمە، کەچی جیبال تا ئەو دواییەش گوزارشێکی ڕوونی چالاکی کۆمەڵایەتی و ئیداری و سیاسی کوردە، لە نەخشەی ئیبن حۆقل زۆر بە ڕوونی و (دیار العرب) لێکتر جیا کراوەتەوە، لە نەخشەی (ئیراتۆتینیس ١٩٦ پ م) هیرۆدۆتس (نیوەی سەدەی (٥) پ. ز.) ناوی (میدیا)ی لەسەرە، (بلاد العرب)یش لە جەزیرەی عەرەبی ئێستا دیاریکراوە[٢]، بەدەگمەن نەخشەیەکی کۆنی بیانی و ئیسلامی نادۆزیەوە یان کوردستان یان بیلاد جەزیرە یان بیلاد جیبال ی لەسەر نەبی.

ناوی عێراقیش کۆنە بەڵام لە پەیوەندیی بە عەرەب لاوازە، واتە گوزارشت لە عروبیەتی خاکەکەی ناکا، خۆی ناوێکی عەجەمیە و موڵکی

---

١. العراق في الخوارط القديمة، خارطة (رقم: ١).

٢. خارطة (رقم: ٨) و (رقم: ٩).

فارس بووه، به کورتی گوزارشت له پەیوەندیەکی یاسایی سیاسی و مێژوویی نێوان (هەرێم و گەل و دەسەڵاتی) عەرەبی ناکات، کە یەکێکە لە مەرجە هەرە بنچینەیی دەوڵەتی ڕەسەن بە پێی یاسای نێودەوڵەتی، دووبارە بە پێی چالاکی ئیداری و سیاسی و یاسای میللەتی عەرەب ئەو ناوە نەهاتۆتە کایەوە، ئەگەر چالاکیەک لەو شێوەیە لە مێژوو بەدی بکری زیاتر لە هەمووان گوزارشتی لە شانۆیەکی فارس کردوە، بۆیەش دەبینین لە ڕێککەوتنامە نێودەوڵەتیەکان سەبارەت بە عێراقیش ئەو ناوە نەهاتووە تا لە لۆزانی (١٩٢٣) بۆ یەکەم جار لە ماددەی (٣) دوو جار هاتووە، بەڵکو کیرزۆنی بەریتانیا ناوی عێراقی زیندووکردەوە لە جیاتی میزۆپۆتامیای عەرەبی[١].

هەرچی کوردستانە ناوێکە ڕێک گوزارشت لەو پەیوەندیە دەکا، ئینجا سەرباری ئەوەش ناوی کوردستان لە دوای دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرن بە بڕیار نەهاتۆتە کایەوە، بەڵکو لە ئەنجامی چالاکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئیداری و یاسایی مێژوویی کورد هاتتە کایەوە، بۆیە ڕەسەنایەتی کوردستان بۆ ناسنامەی نەتەوایەتی زۆر بە هێزترە لە زۆربەی وڵات و نیشتمانانی دەوروبەر، ڕەسەنایەتی کوردستان و گوزارشتی یاسایی و سیاسی ناوەکەی بۆ ئەو خاڵانەی خوارەوە دەگەڕێتەوە:

أ- ئەو ناوە لە خودی کوردستان هەڵقوڵاوە، ئەگەر دەڵێن سوڵتان سنجاری سەلجوقی (سەدەی ٥-٦کۆ) ئەو ناوەی بەرپا کردوە زۆر دروست نییە، سەرچاوەی ئەو زانیاریە یەکەم جار لە لای (کی

١. ولاية الموصل... ص٦٦.

PDF 4 KURD

لیسترینگ) له کۆتایی سەدەی (١٩) له کتێبی (بلدان الخلافة الشرقية، ص٢٢٧) ئاوا بڵاوکردەوە: هەر ئەویش دەڵێت یەکەم جار لە نووسینی فەرمی لە کتێبی (نزهة القلوب) ی حەمەدوڵڵای مستەوفی (٧٤٠ک) لە سەدەی (١٢) هاتووە و وەسفی کوردستانی بە (١٦) هەرێم کردوە، محەمەد ئەمین زەکیش لەوانی گواستەوە و بووە ڕاستیەکی مێژوویی، ڕاستیەکەی پێش ئەویش ئەو ناوە هەبووە (سوڵتان سنجار) پەرەی پێداوە لە ناوێکی میللیی جوگرافی بۆ ناوێکی ئیداری، لە شیعر و پەند ناوی کوردستان پێش ئەو مێژوە دۆزرایتەوە، له ڕێنماییەکی (شێخ ئادی کوڕی موسافیری هەکاری) بە نازناوی شەڕەفەدین (شرف الدين) هاتووە:

شەڕەفەدین میر ل دیوانێ
خەبەرێ بدەنە کوردستانێ
بلا قایم بکن ئیمانێ[1]

ڕەشید فەزلوڵلای مێژوونووسی مەغۆل لە (جامع التواريخ) پێش ئەو بەرواره باسی کوردستانی کردوە، لە سەرچاوەکانی فارسیش پێش ئەو بەرواره ناوی کوردستان هاتووە .

ب- ئەو ناوە گوزارشت لە شوێنی کوردان دەکا، لە چوارچێوەی کۆمەڵێک ناوی وەک (اقليم الجبال)[2]، (اقليم الجزيرة)، (شهرزور)،

---

١. بۆ زیاتر توێژینەوەیەکی سليمان الدخيل بەناوی (حقيقه وجود الكردي في الموصل) بخوێنەوە.

٢. له کۆنترین نەخشەی سەر زەوی کە لە دوای سەرگۆن (٢٣٠٠پ ز) کێشرابێ، بەشی (الجبال) له سەرووی بابل و بلاد اشور دیاریکراوە. ئەو نەخشەیە لە (ژ: ١)ی (العراق في الخوارط القديمة) دانراوە.

(میزۆپۆتامیا)... لە دوای سەدەی (١٢) ناوی کوردستان بەرەبەرە بەرەو زاڵبوون بوو، یەکەم جار لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانی ئێستا، دوای بەرەوسەروو، لە سەدەی (١٧)ـش بەتەواوی کەوتە نێو فەرهەنگی عوسمانی، ئینجا خوارووش، بەوشێوەیە لەگەڵ ڕابوونی هەستی نەتەوایەتی لە جیهانی ئیسلامیدا لە کۆتایی سەدەی (١٩) دەرکەوتنی پەیوەندیی ناسنامەیی نێوان ناوی وڵات و میللەت، ئەوا ناوی کوردستان جێی هەرێمی جیبال و هەرێمی جەزیرە و میزۆپۆتامیای گرتەوە.

پ- لقی ب بریتییە لە گەشەی ئاسۆی ناوی کوردستان و پانتایی جوگرافیەکەی، ئێستا باسی گەشەی ستوونی ناوی کوردستان دەکەین لە ناوێکی میللی دەڤەری بۆ ناوێکی ئیداری لە سەدەی (١٢)، لە سەدەی (١٧)ـش بووە ناوێکی ئیداری عوسمانی، لە کۆتایی سەدەی بیستەم بووە ویلایەتێکی فەرمی عوسمانی و بەو شێوەیە لە ئیداری گەشەیکرد بۆ سیاسی، لە نەخشە جوگرافی و ئیداریەکان پەڕیەوە بۆ نەخشەی سیاسییش[١]، لە ڕێککەوتنامەی سیڤەری (١٩٢٠) بووە ناوێکی یاساییش کاتی لە بەشی سێیەمی بە ئەدرێسێکی سەربەخۆ تۆمارکرا. بەو شێوەیە کوردستان لە سەرەتای

---

١. لەناو بەڵگەنامەکانی عوسمانی بۆ یەکەم جارە د. عوسمان عەلی کۆمەڵە بەڵگەنامەیەکی دۆزیتەوە لەبارەی زانیاری نوێ سەبارەت بە کوردستان، بە تایبەتی لە بارەی ویلایەتی کوردستان، کە وەرچەرخانێکی گرنگە لە مێژووی (ناوی کوردستان) لە ئیداریەوە بەرەو سیاسی.. بڕوانە: الكرد في الوثائق العثمانية.

PDF 4 KURD

سەرهەڵدانی دەوڵەتی نەتەوەیی و مۆدێرن قۆناغەکانی جوگرافی و ئیداری و سیاسی و یاسایی پێش تورکیا و عێراق و سوریا و ئوردەن و زۆربەی ناوە یاساییەکانی ئێستای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بڕی (جگە لە ئێران نەبێت).

ئێستا هەر لە قۆناغی ساغکردنەوەین لەسەروو ناوی ڕەسەنی کوردستانمان و سنووری سەرووی عێراق و جیاییمان لەگەڵ یەکتر ساغکردەوە، ئێستا بەرەو ئەوە دەچین کە سنووری خوارووی کوردستان و (ناوچە دابڕاوەکان) ڕاستەوخۆ دیاری بکەین، لە پێشدا بەرەو ئەو بەڵگەنامانە دەچین کە سنووری کوردستان زۆر لە خوار ئەو ناوچانە بووینە کەئێستا ناکۆکی لەسەرە.

**ئەو بەڵگەنامانەی موسڵ تا بەغداش بە کوردستان هەژماردەکەن:**

ئەو بەڵگەنامانە دەگەڕێتەوە بۆ پێش دروستبوونی عێراق و پێش سەردەمی مەرکەزیی عوسمانی کە لە ناوەڕاستی سەدەی (١٩) دەستپێدەکا، بەو شێوەیەی خوارەوە:

١. بە پێی (آثار البلاد و اخبار العباد – قزويني، ص٢٨٣) لە ماددەی: الاقليم الرابع/هەرێمی چوارەم: موسڵ و بەغداش وەک باقی کوردستان سەر بە ئەو هەرێمە پۆلێندەکات، لە کاتێکدا عێراقی عەرەبی سەر بە هەرێمی سێیەمە، هەروەها لای هەموو موعجەم و گەڕیدە و جوگرافیناسەکان بەغدا سەر بە عێراقی عەرەبی نەبووە بەڵکو سەر بە هەرێمی عەجەمی (فارسی یان کوردی) بووە.

PDF 4 KURD

٢. لە (ج١ معجم البلدان) لە بابی إيراهستان: باس لە سەرچەلەی ناوی عێراق دەکا و دەڵێ لە (ئیراه) هاتوە و دەشیبەستێتەوە بە ئەردەشێر، ئەردەشێریش کوردە، کەواتە بە پێی بەشێکی پسپۆران لە کوردۆلۆجی ئەوا ئەو ناوچەیە و بەغدا و خواروشی زیاتر مولکی کوردە تا نەتەوەکانی تر.

٣. بە پێی هەندێ سەرچاوەی کوردی ناوی بەغدا کوردیە دەگەڕێتەوە بۆ دوو وشە: باغ + داد، بۆیە لە سەردەمی ئەبو جەعفەری مەنسورِ ناوەکەی گۆڕی بۆ مدينة السلام (دوایش بۆ المدينة المنصورة). لەمەش ڕوونتر یاقووتی حەمەوی دەڵێت: اصل بغداد للأعاجم[١].

٤. ئەرشاک سافراستیان لە (الكرد و كردستان، ص٦٥) دەڵێ: بەغدا زێدی ڕەسەنی کوردانە.

٥. لە دەوروبەری بەغدا ئەو دەسەڵات و میرنشین و دەوڵەتە دەڤەریانەی درووستبوونبێت زیاتر کوردبوونە، جگە لە دەوڵەتی حەسنەوی کورد لە ڕۆژهەڵاتی بەغدا بەرەو سەروو ئەوا دەسەڵاتێکی تری گرنگی کورد لە ئەهوارەکان و خوارووی بەغدا درووستبووە بەناوی (شاهینە) بە ناوی [عیمرانی کوڕی شاهین لە (٣٣٨ ک = ٩٤٠ز)] ناوبانگی پەیدابوو[٢]. هەموو گەڕیدەکان کوردستانێتیی کەرکووک

---

١. معجم البلدان، ج١، ص٤٥٦.

٢. لە لایەن مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی لە چوارچێوەی (٤) دەوڵەتە کوردیە لەبیرکراوەکان باسیاندەکا. بەڕوونی ناسنامەی کوردی پێداوە لە لایەن (شەرەفخان و محەممەد ئەمین زەکی) و ناوی نەهاتوە لە (مراقد المعارف للشيخ محمد حرز الدين ج٢، ص١٣١) و (عمران بن شاهين الخفاجي، (سوسنطردي) أمير البطيحة (البطيحة : - أرض واسعة بين واسط و البصرة)=

دەسەلمێنن. لە سەردانی ڕیچ بۆ کوردستان، هەر لە بەغدا دەردەچی میوانی حاجی عەبدوڵڵا دەبێ ئیتر بەولاوە و بە دیالا و تووز و کەرکووک ڕەتدەبی بە سەفەر، بە کوردستانی تۆمارکردوە.

٦. لە نامەیەکی والی بەغدا بۆ سەرۆک وەزیرانی عوسمانی (سەدری ئەعزەم) لە بەرواری (٢٨ی مایسی ١٨٤٧) چەند جارێک دووبارەی دەکاتەوە و دەڵێ دەوروبەری بەغدا هەمووی کوردن[١].

٧. لەوەش زیاتر ئیبن بەتووتە دەوروبەری بەسرەش بە کورد وەسفدەکات و دەڵێ کاتی لە بەسرەوە بەرەو ئەسفەهان ڕۆیشتم لە ڕێگە لامدا میوانی عەشایرە کوردەکان بووم. لە بەڵگەنامەیەکی بەریتانیدا کە تێیدا باڵوێز(کانسیری) لە بەغدا زانیاری سەبارەت بە ڕووداوەکانی کوردستان دەنێری و دەستنیشانی سنووری باشووری بۆ نزیک (محەمەرە) دەکا و زیاتر لەوەش ئەم زانیاریە لە بەرپرسێکی گەورەی حکومەتی عێراقەوە دەگوازێتەوە[٢].

---

=له (معجم البلدان،ج٢، ص٢٣٨) هاتوه: "زعيم قبائل خفاجة في العراق، توفي في المحرم سنه ٣٦٩ هـ بالبطيحة ئيبن ئەثير لە (كامل في التاريخ) بە ڕێگر وەسفیاندەکا، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە تەنها لە سەرەتا هەندێ کاری ڕێگری لە ئەهوارەکان کرا بەر لر بوون بە دەوڵەت.

**١.** د. عثمان علي، الكرد في الوثائق العثمانية، ص١٤٣.

**٢.** WO 329/2869 من السفارة البريطانية، بغداد.

الى الدائرة الشرقية – وزارة الخارجية البريطانية ٥/ شباط/١٩٥٩.

... و في اليوم الثالث من المحاكمة صرح مهداوى تصريحا مثيرا للغاية حول الكرد، قائلا و التي سبق و ان اشرنا اليه في الفقرة (٢) من البرقية (رقم١٠٢) بتاريخ (٢٧ كانون الثاني) و التي يزعم بأن نفوس العراق سيصل عام (١٩٦٠) الى(١٠) ملاين أن الكورد الذين يسكنون في المنطقة الجبلية كبيرة بدا من اسكندرونة و انتهاءا بالمحمرة، يعتبرون حماة الجمهورية العراقية الديموقراطية..

PDF 4 KURD

٨. یاقووتی حەمەوی و زۆر سەرچاوەی تر لە باسی حیللە (حلة) باس لە کێشەیەک دەکەن لە نێوان کورد و ئەهلی (جامعین)دا، لە دەرەوەی حیللەش هەبووینە بەڵام نازانرێ ناسنامەی جامعین چیە، بەڵام چ باسی عەرەبی لە ئارادا نییە.

لە دوای ئەوانە واتە بۆ نزیکی سەدەی بیستەم گەڕیدە و جوگرافیناسەکان لە بەغداوە بەرەو سەروو بۆ لای حەمرین و موسڵ لەسەر کوردستان تۆمارکراوە، وەک ئەوانەی خوارەوە.

٩. کۆتلۆڤ وای دیاریکردوە: هەردوو ڕۆخی دیجلە و فوڕات تا دەگاتە دەوروبەری بەغدا عێڕاقە، هەرچی سەرووی بەغدایە ئەوە سنووری کوردستانی خواروەوە[1].

١٠. لە کتێبی (عشائر العراق/ عباس العزاوي) و لە کتێبێکی تری لەسەر کوردە فەیلیەکان باسی لە بوونی کورد لە خواروی بەغدا بە چڕی دەکا، ناوی زۆربەی عەشیرەتەکانی بردووە کە کوردن، ئێمە لە کتێبێکی عەرەبیمان بە ناوی (الإسلام و العلمانية و اثرهما في نشأة الدولة العراقية الحديثة) بە وردی باسی سەرکردە و هەیئەکانی شۆڕشی بیستمان کردوە جگە لە چەند کەسێک نەبێت بە دەگمەن عەرەبی تێدایە، ئێستا لەو سەرچاوە و سەرچاوەی تر باس لەوە دەکەن عەشیرەتە کوردەکان لە خواروودا پێشڕەوی ئەو شۆڕشە بووینە، بۆ ئەو مەبەستە زیاتر بڕوانە: (مذكرات برترام توماس - الحاكم السياسي البريطاني في منطقة الناصرية بين سنتي ١٩١٨. ١٩٢٠) و محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی

---

١. کوتلوفک، ثورة عشرين، ص٢٥.

له کتێبی (أربع دول كوردية) هەروەها (مصطفى جواد - جاوان العشيرة الكوردية المنسية).

١١. زۆربەی سەرچاوە کۆنەکان ئەگەر باسی پێکهاتەی بەغدایان کردبێ گوتوویانە پێکهاتووە لە یەهوود و کورد و عەرەب و فارس. فورستر دەڵێ: سێیەکی بەغدا یەهوودین[١]، تا ئەو ڕادەیە لە شاری بەغدا لە جیاتی هەینی ڕۆژی شەممە پشوو بووە[٢]. لە ساڵی (١٩٠٠ز) نوێنەری بەغدا بۆ مەبعوسان (پەرلەمانی عوسمانی) هەڵبژێردرا (٣) کەس دیاریکران: ئیسماعیل حەقی بابان (کورد) و ساسون حسقیل (یەهوودی) و مەحموود ئالوسی (بە عەرەب تۆمارکراوە بەڵام لەوەش گومان هەیە). حنا بەتاتۆ ناوی (٢٠) لە یەکەمە موڵکدارەکانی ساڵی (١٨٩٤)ی بەغدای کردۆتە خشتەکێک کە تەنها دووانیان عەرەبن[٣].

١٢. ڕۆژهەڵاتناس (نورمان) لە کتێبی (تاريخ الشرق القديم)دا دەڵێ: ماڵە کوردەکان بە بەرفراوانی هەنە هەر لە کەنداوی عەجەم (بەسرە) تا دەریای قەزوین و دەریای ڕەش و دەریای سپی و بەرەو ئەسکەندەروونە و بە ئاڕاستەی موسڵ تا دەگاتەوە ڕۆژهەڵاتی بەغدا.

١٣. لە (بلدان الخلافة الشرقية، لا ١١٦) دەڵێ: موسڵ لە سەدەی (١٠) هەمووی کورد بوون، ئیبن حۆقلیش هەروا دەڵێت و گەرەکانیشیان بە ناوی: لاری و هەزبانی و حەمیدی...هتد

١. فورستر، نشأة الدولة العراقية، ص١١٥.

٢. د.علي الوردي، لمحات...، ج٥، ص١٢٧.

٣. حنا بطاطو، العراق، ج١، ص١٨٥.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

١٤. ڕێککەوتنی ئەرزەڕۆم کە لە (١٨٢٣/٧/٢٨) مۆرکرا، پێکهاتووە لە (٧) بەش. لە بەشی یەکەمدا باس لە کوردستان دەکات و دەڵێ سنووری دەگاتە نزیک بەغدا[1].

١٥. بلازری (٢٧٩ک) لە (فتوح البلدان، لا٤٠٧) دەڵێ: لە شاری موسڵ کوردەکان شەڕی سوپای ئیسلامیان کرد لە (٦٣٧ز). دەڵێ: ئەوشارە لە پێش فەتح تەنها دوو گەڕەک بوو، لە گەڕەکەکیان کوردە ئاگرپەرستەکانی لێبوو، ئەوانی تریش مەسیحی بوون. هەریەکە لە ئێستاخاری و ئیبن ئەثیر (١١٦٠- ١٢٣٣ز)یش وایان گێڕایتەوە.

١٦. هەریەکە لە تەبەڕی (٨٣٨. ٩٢٣ز) و مەسعوودی (٨٩٦-٩٧٥ز) و حەمەوی (١١٧٨ز) و ئیبن خرداذیە (٨٢٠- ٩١٢ز) و ئیبن خەلدوون (١٤٠٦ز) و ئیبن خەلەکان (١٢١١-١٢٨٢ز) و ئیبن حۆقەل (٩٧٧ ز) دەڵێن: زۆر لەمێژە کورد لە موسڵ و دەوروبەری جێگیربووینە و چەندین گەڕەکیشیان لە ناو موسڵ هەیە، لە لایەکی تریشەوە لەگەڵ ئیبن بەتووتە (١٣٠٤. ١٣٧٧ز) هاوڕان کە لە (رحلة ابن بطوطة)دا دەڵێ: إن مدن موصل و ماردين و سنجار هى مدن كردية. لە لاپەڕە (٧٤)ی ڕاپۆرتی ولایەتی موسڵ لە چوارچێوەی بەڵگەکانی بەریتانیا کە لە قازانجی عێڕاق و عەرەب بووە کەچی لەوێش ناوی نەینەوا بە نەینەوای کوردستان دەبا.

١٧. مەقریزی لە (السلوك و المعرفة دولة الملوك)، حەمەوی لە (معجم البلدان) دانیشتوانی موسڵ بە زۆرینە دانیشتوانی عەشایرە کوردەکان وەسفدەکا. چەلەبی زادەی بەغدادیش لە (كشف الظنون-

---

١. بڕوانە: چارەنووسی فیدڕالی دوای دەرچوونی عێڕاق لە بەندی ٧.

PDF 4 KURD

١٦٣٨) دووپاتی ئەو ڕاستیانە دەکاتەوە. خۆن هامەر ی ئەڵمانی ڕۆژهەلاتناس لە (تاريخ الدولة العثمانية ج٤، ص٢٨) دەڵێ: دانیشتوانی موسڵ زۆربەی کوردن کەمێکی عەرەبیشی لێیە.

١٨. لە (دائیرەی مەعارفی فەڕەنسی) دەڵێ: جەزیرە و موسڵ و کەرکووک و هەولێر و سلێمانی و ڕانیە و کفری یەک هەرێمی سەربەخۆ پێکدەهێنن.

١٩. لە (عجائب البلدان)ی سیراجەدین ئیبن وەردی (مادە: أرض الجزيرة): لە وەسفی (جزيرة ابن عمر) دەڵێت: و تشتمل على ديار ربيعة و مضر، و تسمى دياربكر، و هى ما بين دجله و الفرات و كلها تسمى بالجزيرة، و بها مدن و قرى عامره. و من مدنها المشهورة الموصل.

٢٠. ئیمامی زەهەبی لە (العبر في خبر من غبر) و لە زۆر سەرچاوەی تری مێژوویی ئیسلامی تر باس لەوە دەکرێ جارێکیان گەلە دزێکی کورد بەغدایان داگیرکردوە، ئەوەش مانای ئەوەیە ئەگەر بەغدا کوردیش نەبووبی ئەوا ئەوەندە لەژێر ڕکێفی کورد دوور نەبووە.

٢١. جوگرافی ناسی گەورەی عوسمانی شەمسەدین سامی لە (قاموس الأعلام) لە (مادە: کەرکووک)دا دەڵێت سەر بەولایەی موسڵە، بەلام بەوەش ناوەستی دەڵێ ویلایەتی موسڵی کوردستان، واتە نەک کەرکووک تەنها بەڵکو تەواوی ویلایەتی موسڵ کوردستانیە.

٢٢. مندوب السامي البريطاني - همفريز الوثائق السرية - بغداد (١٩٢٩/٤/٢٣): ... لەو بەڵگەنامەیە باس لەو ناوچەیەی ئێستا ناوینراوە (مناطق متنازع عليها) دەکا داوا دەکا زمانی فەرمی ئەو ناوچەیە

PDF 4 KURD

کوردی بێت چونکە کوردن، لە کۆتایی بەڵگەنامەکەدا خشتەکێکی دانیشتوانی دەرەوەی موسڵ (٧٠%)ی کوردن داناوە، بەڵام باسی ناو موسڵی نەکردوە.

لە بەڵگەنامەیەکی تر (CO 730/ 161/2) سکان کردستان: شاری دیالە بە کورد پیشاندەدا:.. و اذا اجريت احصاء دقيق و لم يحسب الكرد ضمن عرب السنة يكون عدد الكرد و العرب متساويا. فمثلا تم تجاهل عدد الكرد في لواء ديالى ذات الاغلبية الكردية و الاقضية الكردية في كوت في الاحصاءات السابقة[1].

٢٣. موسڵ لە بەڵێننامەکانی عێراق بۆ (عصبة الأمم): بۆ ئەوەی عێراق لە عوسبە وەرگیری (١٠) بەڵێننامەیدا، لە بەڵێننامەی (ژ:٩/ لقی١) تێیدا بەڵێن بە (عصبة)دەدات کە زمانی کوردی لە موسڵیش فەرمی دەبێت.

٢٤. تقرير لجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع التركي البريطاني حول ولاية الموصل)*: لە لاپەڕە (٢١٩) دەڵێ عێراق هیچ مافێکی لەو ناوچەیە (ویلایەتی موسڵ) نییە و ناوی عێراقیان هەرنەبیستوە، لە لاپەڕە (١٥٣) دەڵێ: نێوان موسڵ و بەغدا هیچ ناوێکی دیاریکراوی نەبووە، لە لاپەڕە (٢١٨) ڕاستەوخۆتر دەڵێ ویلایەتی موسڵ کوردیە، هەر لەو ڕاپۆرتەدا دەڵێ شریف پاشای کورد لە (١٩١٩) داوای تەواوی ویلایەتی

---

١. لە بارەی کوژرانی (محمد بن الحسين بن علي بن حمدون أبو الحسن البعقوبي) خەتیبی بەغدادی لە زنجیرە زۆرەکانی (تارخ البغداد لە ج٢، ص٢٥٢)دا هاتوە: قتل بحلوان في شهر ربيع الأول من سنة (٤٣٠) قتله أبو الشوك أمير الاكراد. واتە ئەو ناوچەش دەسەڵاتی کوردی لێ بووە.

* - ئەو ڕاپۆرتە لە کتێبی (ولایە الموصل، مراجعة و تحقيق عبدالرزاق القيسي) بڵاوکراپتەوە.

PDF 4 KURD

موسڵی کردۆتەوە بەپاڵپشت بە هەردوو (دائیرەی مەعاریفی بەریتانی و فەڕنسی)، هەر لەو ڕاپۆرتە لە لاپەڕە (١٥٩)دا باس لەوە دەکا کە لە سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی (١٥٣٤) و دواتریش بەغدا و موسڵ و کەرکووک بە ولایەتی شارەزوور ناوزەددەکرا.

٢٥. لە (معجم البلدان- حموی- ج٢، ص١٣٤ و ١٣٥) لە ڕاقەی (جزيرة آقور) –جەزیرەی ئیبن عەمرٍ هاتووە: بين دجله و الفرات، من أمهات مدنها حران، الرخة، رأس العين، نصبين، سنجار، خابور، صمد، ميافارقين، الموصل.

٢٦. لە (القاموس السياسي - احمد عطية الله، ص ٩٦٨) کە لە ساڵی (١٩٦١) دەرچووە - لە بابەتی کوردستان شارەکانی کوردستان ڕیزکردوە موسڵیشی بەگەر خستووە.

٢٧. بە بۆنەی تویژینەوە لە ماددەکانی (٦٢ و ٦٣ و ٦٤)ی سیڤەر سەبارەت بە کوردستان مێژوونووسی عەرەب عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی دەڵێت: لێرەوە بیری دەوڵەتێکی کوردستانی سەربەخۆ خەملی بۆ هەر (٥) لیوای کوردی: (سلێمانی، هەولێر، دیالی، کەرکووک، موسڵ)[1].

٢٨. نەخشەی ئیساک تیریۆنی هۆڵەندی دەگەڕێتەوە بۆساڵی (١٧٩٠ز)، لەو نەخشەیەدا ناوی شارەکانی کوردستانی لێ تۆمارکردوە، لەوانە: شاری عمادیە (ئامێدی)، ئەربیلا (هەولێر)، آثار نینوى، تبليس..

٢٩. لە نەخشەی سایکس پیکۆش تەنها بەغدا و بەسرەی بە میزۆپۆتامیای خواروو دیاریکرد.

---

١. عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج١، ص٢٨٠.

PDF 4 KURD



## ١. سنووری خوارووی ناوچە دابڕاوەکان بە پێی بەڵگەنامە ئیسلامیەکان:

أ- لە خوارووی جەبەل حەمرین ناوی جیاجیای وەک بیلاد بابل، بیلاد سۆمەر، عیراقی عەرەبی، عیراقی عەجەمی، بیلاد مابێن نەهرێنی باشوور، میزۆپۆتامیای عەربی، سواد، منتەفک،... کە دوای عێراقی عەرەبی لێ پێکهات، هەرچی لە سەرووی جەبەل حەمرین ئەو ناوانەی هەڵگرتوە: هەرێم- ئیقلیم، جیبال، بیلاد ئەکراد، میزۆپۆتامیا، جەزیرە ئیبن عومەر، کوردستان، بیلاد شەهرەزوور... دوایی کوردستانی گەورەی لێ خەملی.

ب- زۆربەی جوگرافیناسە کوردەکان پێیانوایە ئیبن خلدوون ناوی (جبل حمرین) بە جبل الاکراد دەبا ئەوە دەقەکەیەتی:. إلى الإقليم الرابع و فيها هنالک بلد المراغة في شرق جبل الاكراد المسمى بأرمى و قد مر ذكره في الجزء السادس[1]...

---

١. إبن خلدون، مقدمة، ص٧٤. هەرچەندە ئەوەندە شارەزای جوگرافی نیم بەڵام بە وردی سەرنجمدا نەخشە کۆنەکان و ئەو چەمکە جوگرافیانەی سەردەمی ئیبن خەلدوون،گومان هەیە ئەو شوێنە مەبەستی (جبل حمرین) بێت چونکە لە نەخشەی (ژ: ٣)ی کی لیسترنگ (بلدان الخلافة الشرقية) شوێنی مەراغەی لە نزیک دەریاچەی ورمێ دیاریکردوە ئیستاش هەر لەوێیە. لە نەخشەی (ژ: ٢) شوێنی جەبەل حەمرینی بە (بارما) تۆمارکردوە. ئیبن خەلدوون و زۆربەی جوگرافیناسەکانی ئیسلامی لەوپەڕی سنووری کوردستان لە سێ شوێن ناوی (جبل الاكراد) دەهێنن یەکێکیان ئەوەیە، دوەمیان لە نێوان بەسرە و ئەسفەهان، ئەوی تر لە عەفرین سەرووی ڕۆژئاوای شام نزیک دەریای ناوەڕاست.

پ- له زۆربەی سەرچاوە ئیسلامیەکان باس لەوە دەکەن کە لە (٦٤٠ز) ئیمامی عومەر فەرمانی بە (عتبە بن فرقد) کرد موسڵ ڕزگاربکات، پێی گوت خەڵکی موسڵ سمێڵ گەورە و پرچ درێژن زمانیان عەرەبی نییە... مەبەستی ئێزیدیەکان بووە. بلازەڕی لە (فتح البلدان) و ئیبن ئەثیر(١١٦٠- ١٢٣٣ز) لە (الکامل في التاریخ) دەڵێ لەو هێرشەدا بووە شەڕیان لەگەڵ کوردی نەینەوا. ئەوەش بەڵگەی کوردبوونی ئەو ناوچە و زیاتریشە.

ت- بلازری (٢٧٩ هـ) لە (فتوح البلدان، ص٤٠٧) لەو کتێبە باسی گرتنی شاری موسڵ دەکا لە لایەن سوپای ئیسلام، کوردەکان شەڕیان کرد، دەڵێ: ئەوشارە لە پێش فەتحی لە (٦٣٧) تەنها دوو گەڕەک بوو، لە گەڕەکەکیان زەردشتیە کوردەکان بوون، ئەوانی تریش مەسیحی بوون.

ج- هەریەکە لەو دوو سەرچاوەی سەروو (المسعودي ٨٩٦-٩٧٥م). و (الطبري ٨٣٨. ٩٢٣م) دەڵێن لە (٧٧٥ز) کورد لە موسڵ لە عەباسیەکان ڕاپەڕین، جارێکی تر لە (٨٣٨ز) بە سەرۆکایەتی (جعفر بن رجب الداسني) و لە (٨٦٨ز) بە سەرۆکایەتی (مساوار بن شاري الکوردي) و دوایش هەروەک (ابن الاثیر) (١١٦٠- ١٢٣٣م) دەڵێت دەستیان بەسەر موسڵ داگرت لە سەردەمی خەلیفە موعتەسەم.

چ- ئیبن خەلەکان لە کتێبی (وفیات الاعیان، ص١٩٣) دەڵێ: لە سەردەمی سەرەتای ئیسلامەوە هەر ناوی کەرکووک ڕاستەوخۆ بەندبووە بە (بلاد شهرزور)، هەروەها دەڵێت: کەرکووک مەڵبەندی شارەزوور و زۆر میرنشینی کوردی تر بووە.

PDF 4 KURD

ح- له چوارچێوەی ڕێککەوتنامەکەی بەدلیسی سوڵتان (١٥١٤). بەشێک لە میرنشینەکانی کورد لە کەکوک بوونە و شێوەی فەرمیان وەرگرتووە بە هۆی ئەو ڕێککەوتنە، لە سەردەمی سوڵتان مورادی سێیەم لە (١٥٨٣) میرنشینی ئەردەلان کەوتۆتە سەر ویلایەتی شارەزوور بە فەرمی، لە ساڵی (١٦٩١) پایەتەختی ئەردەلان لە زەڵم گوازرایەوە بۆ کەرکووک، محەممەد ئەمین زەکی دەڵێت: دوای ئەردەلان کەرکووک کەوتە ژێر ئیدارەی سیاسی بابانەکان تا دیالە و خوارووی حەمرینیش بە فەرمی و یاساییانە فەرمانڕەوا بووینە لە چوارچێوەی ڕێککەوتنەکە.

یەکەم والی و دەسەڵاتداری ئیالەی شارەزوور سەرکردەی ئەردەلانی (بێکە بەگ) بووە، یەکەم فەرمانڕەوای سنجاقی کەرکووک مەئمون بەگی کوڕی بێکە بەگ بووە لە سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی هەر لە چوارچێوەی ڕێککەوتنامەکەی بەدلیسی سوڵتان*.

خ- حەمدوڵڵا مستەوفی (٧٤٠هـ)[١] لە کتێبی (نزهت القلوب) بۆ یەکەم جار[٢] باسی سنووری کوردستان دەکا و هێڵەکە لە کرماشانەوە بەرەو شارەزوور و دینەوەر دەکێشی.

---

*- لە لاپەڕە (١٩٩-٢٠٠)ی شەرەفنامە و لە لایەن محمد ئەمین زەکیش لە (تاریخی سلێمانی) باسیانکراوە.

١. حەمدوڵڵا مستەوفی (٧٤٠ک)ـیش بە قەزوینی بەناوبانگە بەڵام جیایە لەگەڵ خاوەنی کتێبی (آثار البلاد و اخبار العباد) ئەویش بە قەزوینی بەناوبانگە ئەوەیان ناوی تەواوی (زکریا بن محمد القزويني)ـە (٦٠٠-٦٨٢ک).

٢. کی لسترنگ لە کتێبی (بلدان الخلافة الشرقية) دەڵێت بۆ یەکەم جار حەمدوڵڵا مستەوفی (٧٤٠ک) لە کتێبی (نزهت القلوب) باسی کوردستان دەکا.

PDF 4 KURD

د- ئـەولیا چەلـەبی (١٠٦٥ک) ئـەو سـنوورەی خـواروویی کوردسـتان بـە ڕوونتـر دەکێشـی لـە موسـڵەوە بـەرەو بەسـرە. دوای هـەروەک لـە (ولایـة الموصـل، ص٧٣) بـاس لـە (تقـویم العثمـاني ١٧٠٠) و (اطلس الامبراطوريـة العثمانية ١٩١٣) هـەمان سـنووری نێوان کوردسـتان و عێراقی وەک ئەولیا چەلەبی و نەخشەی عوسمانی (١٨٩٦) دەکێشی.

## **٢. سنووری خواروی ناوچە دابڕاوەکان بە پێی گەڕیدەکان:**

ئەگەر باری مێژووی بەغدا و موسڵ ئەوها لە کوردستان نزیک بێت، ڕەنگە پێویست بە بەڵگەیەکی زۆر بۆ کەرکووک و ناوچە دابڕێنراوەکانی ئێستا نەکات. گەڕیدەیەکی زۆر هاتوونە ئەو ناوچەیە و چیان بینیووە نووسیویانە.. هەندێکیان ئیسلامین و ئەوانی تریش بیانین:

أ- گەڕیدەکانی جیهانی ئیسلامی، لەوانە ئیبن بەتووتـە ئـەو ناوچانـەی بـە دانیشتووی کورد وەسفکردوە لـە کتێبێک بـەناوی (تحفة النصـار في غرائب الامصار، ص٢٠٨) و دەڵێ کە سەردانی ئەسفەهان م کرد لە ڕێگە پڕبوو لـە ڕەشـمالی ماڵـە عـەشـایرە کوردەکـان، ئـەوەش لەگـەڵ ئـەو بەڵگـەنامەیـەی بـەریتـانی (WO 329/2869 بغـداد ٥/شـباط/١٩٥٩) دیتـەوە کـە بـاڵوێزی بـەریتـانی لـە بەغـدا لـە ڕاپۆرتێکیـدا دەستنیشـانی سـنووری باشـووری کوردسـتان بـۆ نزیـک کەنداو دەکـا، گەڕیدەیـەکی تـر شـێخ ئەسـفەهانی لـە کتێبێک بەناوی (گەشتنامەی ئەسفەهانی بۆ شنۆ و ورمێ و ڕەواندوز) لـەو گەشـتەی زۆر بـە خراپـی باسـی کـورد دەکـا، بـەڵام دیسـان بەڵگـەنامـەی بـەنرخی تێدایـە و تێیـدا دەردەکـەوێ دەسـەڵاتی سیاسـی و بازرگـانی و کۆمەڵایەتی (ئیالەتی کوردستان) لە نزیک ورمـی تـا موسـڵی گرتۆتـەوە، ئـەو نەچووە بەلای کەرکووک زیاتر سەردانەکانی ئەو تەوەرەی گرتۆتەوە.

PDF 4 KURD

ب- (قلقشندي نهاية الارب في أنساب العرب) دەڵێ کورد لە (٢٠) شوێن هەن، لەوانەش "بلاد کرخینی (کەرکووک) و داقوق"[١].

پ- ئیبن حوقل (٩٧٧ز)، یاقووتی حەمەوی (١١٧٨ز)، ئیبن مهەلهەل (سەدەی٦)، قەزوینی (سەدەی ١١)، ئەبولفیدا (٧٣٢ک بەرامبەر١٣٣١ز)، (ئیبن فەزڵ عومەری (١٣٠١-١٣٤٩)، ئیبن خەلدون (١٤٠٦ز)، ئێستاخاری (٣٤٦ک بەرامبەر٩٥٧ز). باسی کوردیان کردوە لە سەرووی جەبەل حەمرین[٢]، بەڵام باسی عەرەب و تورکمانیان نەکردوە، هەموو ئەوانەش کە باسی شارەزووریان کردوە زۆربەی مەبەستیان کەرکووک بووە.

ت- (منشي بغدادي) بە درەنگەوە سەردانی کەرکووکی کردوە لە ساڵی ١٨٢٠دەڵێ: خەڵکەکەی کورد بوون. دەڵێ: لە دوای (جبل حمرین) نۆرەی قسەکردن بە کوردی دێت.

ج- عەبباس ئەلعەزاوی لە کتێبی (تاریخ الکاکائیة) لە (الجامع المختصر في عنوان التواریخ)ی نەقڵکردوە دەڵێت حوکمی خەلیفە گەیشتە عیراقی عەرەبی و ئەسبەهان و دوایش گەیشتە کەرخینی(کەرکووک) لە (بلاد کردستان).

## ٣. گەڕیدە بیانیەکان:

أ- زەینفۆن لە کتێبەکەی (مسیرة عشرة آلاف..) لە سەربردەی خۆیانی (٤٣١پ. ز) لەگەڵ کورد باس لەوە دەکا ئەوان بە دۆڵی دیجلەدا

---

١. شهاب الدين الأعشى، مسالك الأبصار في ممالك الأمصار، ج٤، ص٣٧٣.

٢. ابن خلدون، مقدمة، ص٧٤.

PDF 4 KURD

ڕۆیشتوون بۆ بابل تەنها باسی عەشایرە کوردەکانی کردوە لە موسڵ و جەبەل حەمرین، باسی عەرەبی نەکردوە. ئەم دۆخە بەردەوام بووە تا پاش خەلافەتی ئیسلام و ئەوەتا یاقووتی حەمەوی لە (معجم البلدان) لە سەدەی (١١) دەنووسی سەبارەت بە بابل؛ لەوێ کێشەی بەردەوام لە نێوان کورد و (اهل الجامعین)دا هەبووە، عەرەبی تێدا نەبووە.

ب- ڕۆژئاواییەکانی دوای ڕابوون: ئەوانە گەلی زۆرن و بە دەگمەنیش سەرچاوەیەک نابینیەوە بڵێت کەرکووک کوردستانی نییە، بەڵکو بەشێکی زۆریان موسڵ و خوارووی جەبەل حەمرینیش بە کوردستان هەژمار کردوە، سەرەکیەکانیان تۆماردەکەین: لیوناردۆ ڕالف لە (١٥٧٤)، میرزا ئەب تالیب هیندی (رحلات في اسيا و اوروبا و افريقا – ١٧٧٩)، جاکسۆن[1] لە کتێبی (مشاهدات بريطانية لمسيبوتاميا -١٧٩٧)، ئۆریندۆ پریەی فەڕەنسی (رحلة من ايران – ١٨٠٧)، جیمس بینگام (رحلات في بلاد مابين النهرين – ١٨١٦)، ڕۆبەرت کیربۆرتەر (رحلات في جورجيا و ايران و ارمينيا – ١٨١٨)، جیمس ریچ لە (١٨٢٠)، ج شیل لە (١٨٣٦)، کارل ڕیتەرلە (١٨٤٤)، مافرینز لە (١٨٩٢)، تادەگاتە مارک سایکس (سفرة في ولايات الخمسة التركية -١٨٩٩)، فون هامری نەمساوی لە (تاريخ الدولة العثمانية)[2]، پانیزە لە (١٩١١)، مذكرات مسیودی فایریسین (من البلقان

١. گەڕیدەی بەریتانی جاکسۆن لە (٢٥ /١٧٩٧/٧) سەردانی موسڵی کرد و دەڵێ: موسڵ زۆر ئاوەدانە و هەموو ئاینەکانی لێیە بەڵام زۆربەی کوردن و زمانی سەر شەقام زیاتر کوردیە.

٢. فۆن هامری دەڵێ: موسڵ کوردن و بە کوردی قسەدەکەن بەڵام تورکی و عەرەبییش دەزانن و قسەی پێ دەکەن.

PDF 4 KURD

حتى برلين)، فورستر(نشأة الدولة العراقية)... ئەوانە هەموی سەردانی کەرکووکیان کردوە، کەسیان نەیگوتووە کەرکووک کوردستانی نییە یان گوتوویانە کوردن یان باسی ناسنامەی نەتەوەییان نەکردوە، بەڵام تێداشیدا هەیە دەڵێ موسڵ سەر بە بیلاد ئەکراده، لیونارد ڕاو ولفی هۆلەندی لە ساڵی (١٥٧٥ز) سەردانی موسڵی کردوە و دەڵێ: من ان الموصل تقع في بلاد الاكراد.

پ- لە یاداشتەکانی مەندوبی ئەڵمانیا لە عێراق (فریتز گروبا) نێوان ساڵانی (١٩٣٢ تا١٩٤٠) لە (العراق في المذكرات الدبلوماسين الاجانب). لە گفتوگۆکانیان لەگەڵ بەکر سیدقی وا باسی کەرکووک دەکەن کە مەڵبەندی کوردستانە.

ت- ئەندازیاری ڕووسی (یوسیب گەرنیک) لە (١٨٧٢ بۆ ١٨٧٣) هاتۆتە کەرکووک لە (ج٦/ قسم القفقاس للجمعية الجغرافية للملكية الروسية) دەڵێت: دانیشتوانی کەرکووک (١٥٠٠٠) کەسن، (٤٠) خێزانیان ئەرمەنی و مەسیحین ئەوانی تر کوردن.

ج- مینۆرسکی دەڵێ: موسڵ و ویلاتەکەی ساف کوردن، سنووری خوارووی کوردستان بریتیە لە سنووری سەرووی دەشتایی میزۆپۆتامیای خواروو.. ئەوەیان هاوڕایە لەگەڵ جوگرافیناسە سۆڤیەتیەکانی تری وەک: سافراستیان، لازاریف، نیکیتین..تادەگاتە مەوسوعەی سۆڤیەتیش.

## ٤. کوردستانێتیی ئەو ناوچە بە پێی نەخشە کۆنەکان:

أ- نەخشەی (ئیبن حۆقل لە سەدەی ١٠)، (ئەلبیرۆنی سەدەی ١٠)، (خوارزمی سەدەی ٨) بنیامین بن حەننا (١١٦٠-١١٧٣)، (ابو حسن

PDF 4 KURD

بن سعيد١٢٧٤ز)... زۆری تر سەرووی بەغدایان بە (جزيرة) ناوزەد کردوە، خوارووی بەغدایان بەعێراق تۆمار کردوە، بەشێکیان سەرووی بەغدایان بە کوردستان یان بیلاد ئەکراد یان وەک ئیبن حۆقل بە (مصايف الاكراد) تۆمارکردوە، هەرچی نەخشەی (نصرالدين الطوسي)ـە موسڵ و تەواوی ویلایەتی موسڵی خستۆتە سەر هەرێمی جەزیرەی کورد.

ب- لە هەردوو نەخشەی ئیداریی عوسمانیی ساڵی (١٨٩٣) و (١٨٩٦) کوردستان زۆر بە گەورەیی تۆمارکراوە و هەموو ئەو ناوچە دابڕاوانە و موسڵ و خوارووی جەبەل حەمرینیش دەگرێتەوە.

پ- لە نەخشەی کۆنی (محمد بن حسين الكاشغري-٧٠٣ز) لە (بلاد کاشغر) نزیک چین تێیدا (بلاد الاكراد)ی دیاریکردوە پێش (١٣٠٠) ساڵ[١] لەو ناوچەیە.

ت- لە نەخشەی (ژ:٥)ی کتێبی گەڕیدەی بەناوبانگی بەریتانی کی لیسترنگ (١٨٥٤. ١٩٣٣) بە ڕوونی هەردوو نەخشەی کوردستان و هەرێمی عێراقی بەجیا دیاریکردوە، بەڵام لێرەدا عێراقە عەجمیەکە و عەرەبییەکەی دیاری نەکردوە، کوردستانی بەشی ڕۆژهەڵاتی (اقليم الجبال)ی دیاریکردوە، گەیشتۆتە شارەزوور و لە خوارووی قەسر شیرین بەرەو ناوەڕاستی عێراقی ئێستا دەڕوا کە لەو سەردەمی لە دوای ئەو سنوورە (اقليم جزيرة ابن عمر) دێت کە کوردستانە، کەرکووک و ناوچە

---

١. ئەو نەخشەیە لە بەغدا لە (ديوان اللغات العثمانية) دانرابوو، بڕوانە: خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردوستان لە پێشەکی ڕاستکردنەوەکانی (محەممەد زەکی بەگ) لە لایەن محەممەد جەمیل ڕۆژبەیانی.

PDF 4 KURD

ناکۆکەکان کەوتونە سەرووی (خوارووی سنووری کوردستان کە لە کرماشان بەرەو حەلوان و قەسر شیرین دەڕوا.

ج- کوردستان لە نەخشەی ئیساک تیریۆنی هۆلەندی: ئەو نەخشەیە لە ساڵی ١٧٩٠ز کێشراوە، ناوی عوسمانی بە تورکمانیا بردووە، لەو نەخشەیەدا کوردستان لەگەڵ عێراقی عەرەبی بەجیا هاتووە، کەرکووک کەوتۆتە ناوەڕاستی کوردستان.

چ- هەردوو نەخشەی ئیداریی عوسمانی (بەشی ئاسیای ساڵی ١٨٩٣و١٨٩٦).

ح- محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە (خولاصە..) نەخشەیەکی کوردستانی بە پاڵپشت بە تێکرای نەخشەکانی ڕابردوو (چوار سەدەی ڕابردووی لۆنگرینگ) ئینجا نەخشەی (مارک سایکس) و نەخشەی (عصبة الأمم)، کۆکراوەی زۆر سەرچاوەی ترە تێیدا کوردستان بریتیە لە دەریای سپی بۆئەرمینیا تا پشت بەسرە لە دیوی ئێران، لە خوارووش لە ڕۆژهەلاتی فوڕات و موسڵ دەگرێتەوە بەسەرووی بەغدا تێدەپەڕی.

## ٥. کوردستانێتیی ئەو ناوچەیە بە پێی موعجەم و ئەنسکلۆپیدیەکان:

أ- بە پێی ئیبن خەلەکان (١٢١١-١٢٨٢ز) لە (وفيات الأعيان، ج٣، ص٢٤٠)، هەروەها (العراق في التاريخ، ص٥٤٨-٥٤٩)، (مظفرالدين الكوكبري، ص١٣٢-١٣٤).. کەرکووک سەربە ویلایەتی شارەزوور و (بلاد جبل) بووە.

PDF 4 KURD

ب- ئیبن خەلدون و چەندین سەرچاوەی مێژوویی ئیسلامی باس لە (جبل الاکراد)[1] دەکەن لە ڕۆژهەڵاتی بەسرە ئەو شوێنەی کە ئیبن بەتووتە لە کتێبی (تحفة النضار في غرائب الامصار، ص٢٠٨) دەڵێ لە بەسرە ڕەتبووم هەموو ڕەشماڵی کوردان بوو، لە دائیرەی مەعاریفی فەرەنسی دەڵێ جەزیرە و موسڵ[2] و کەرکووک و هەولێر و سلێمانی و ڕانیە و کفری یەک یەکە(وحدة إدارية) پێکدەهێنن، هەریەکە لە گەڕیدە بەناوبانگەکانی وەک: ڕۆلف لە سەدەی (١٦) و جاکسۆن لە سەردانەکەی ساڵی (١٧٩٧) و ملینگتۆن لە سەدەی (١٩) هەمان زانیاری و زیاتریش لەوە موسڵیش بە کوردستان وەسفدەکەن.

پ- جوگرافیناسی گەورەی عوسمانی شەمسەدین سامی لە (قاموس الاعلام) لە بارەی کەرکووک دەڵێت کەوتۆتە ولایەتی موسڵی کوردستان، مەڵبەندی ئیالەتی شارەزوور بوو، دانیشتوانیان (٣٠٠٠٠) کەسن، (٣٦) مزگەوت و (١٥) تەکیە و خانقا، و (١٢) خان و (١٢٨٢) دوکان و (٨) گەرماو (حەمام).

لە شوێنێکی تر بە جۆرێکی تر کوردستانێتیی موسڵی گوزارشتکردوە و نکوڵی لە بوونی عەرەبیش نەکردوە لە (ماددەی ویلایەتی موسڵ) دەڵێ: خەڵکەکەی زۆری عەرەبن بەڵام هەرێمەکە پارچەیەکە لە کوردستان.

---

**١.** ... وفي شرقي بلاد خوزستان جبال الأكراد متصلة إلى نواحي أصبهان و بها مساكنهم و مجالاتهم وراءها في ارض فارس... تاريخ ابن خلدون، ص٨١. لە (مقدمة، ص٦٣) دووبارەیکردۆتەوە.

**٢.** أرض الجزيرة: وهي جزيرة ابن عمر، وتشتمل على ديار ربيعة و مضر، و تسمى ديار بكر، وهي ما بين دجلة و الفرات و كلها تسمى بالجزيرة، و بها مدن و قرى عامرة. ومن مدنها المشهورة **الموصل**. سراج الدين ابن الوردي، عجائب البلدان.

PDF 4 KURD

ت- ئیبن حۆقل لە سەدەی (١٠) لە موسڵ بووە دەڵێت: موسڵ ئاو و هەوایەکی خۆش و بازاڕێکی گەرمی هەیە و زۆربەشیان کوردن.

ج - لە دائیرەی مەعاریف ئیسلامیدا[١] دەڵێت کەرکووک مەڵبەندی شارەزوورە و پێکهاتووە لە ناوەندی کەرکووک و هەولێر و سلێمانی لە (١٨٧٩) گواسترایەوە بۆ موسڵ.

چ- لە لاپەڕە (٢١٨)ی ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ دەڵێ: شەریف پاشای کورد لە (١٩١٩) داوای تەواوی ویلایەتی موسڵی کردۆتەوە بە پاڵپشت بە هەردوو (دائیرەی مەعاریفی بەریتانی و فەڕەنسی).

ح- لە ئینسیکلۆبیدیای بەریتانی ساڵی (١٩١١) دەڵێت: شاری کەرکووک کەوتۆتە نێو تەپۆلکەکانی زنجیرە چیاکانی کوردستان سەر بە ویلایەتی موسڵە، قەڵاکەی (١٣٠) پێ بەرزە و یەهوودی تیایە.

خ- لە (موسوعة العالمية العربية) لە (مادە: جبل حمرين) دەڵێ جەبەل حەمرین سنوورێکی سروشتی نێوان کورد و عەرەبە.

د- (الموسوعة الحرة البريطانية) لە (المادة: حمرين): (يعتبر حمرين الفاصل الطبيعي التي يفصل المناطق العربية عن المناطق الكردية في العراق أي يمكن اعتباره الحد الفاصل بين العرب و الاكراد في العراق.

هەروەها لە ماددەی (الكردستان الكبرى) لە بەشی عێراق بەوشێوەی دەقەکەی خۆی کەرکووکی بە کوردستانی تۆمارکردوە: العراق- يتركز الاكراد في الالوية الشمالية و الشمالية الشرقية: محافظة السلێمانية و محافظة أربيل و محافظة كركوك و محافظة دهوك و مناطق (سنجار و

---

١. دائرة المعارف الإسلامية (باللغة الفرنسية)، ج٥، ص١٤٧، وقد ألف ما يتعلق بـ(كركوك) فيها المستشرق (كرامرز)، ثم أضاف إليها (تومابوا) ملاحظات هامه.

PDF 4 KURD

زمار و الشيخان و عقرة و الحمدانية و تل كيف و الجانب الايسر من مدينة الموصل) من محافظة الموصل. و كذلك في منطقتي (خانقين و مندلي) من محافظة ديالى.

ر- (جهان نماه)ی حاجی خەلیفە چەلەبی (١٧٣٢ز) باس لە سنووری کوردستان دەکات و دەڵێ کوردستان لە هەرمزد[1] و مەلاتیەوەڕا دەستپێدەکا تادەگاتە موسڵ و عێراقی عەجەمی.

ز- سیاحتنامەی ئەولیا چەلەبی: (٩) ویلایەتی عوسمانی کوردن و کوردستان پێکدەهێنن: ئەرزەڕۆم، وان، هەکاری، دیاربەکر، جەزیرە (جەزیرەی بۆتان)، ئامێدی، موسڵ، شەهرەزوەر، ئەردەلان.

## ٦. لە سەرچاوە هاوچەرخە عەرەبیەکان:

لەگەڵ ئەوەی دوای سەرهەڵدانی دەوڵەتی مودێرن و بێبەشکردنی کورد لێی ناوی کوردستان لەسەر نەخشە فەرمیەکان سڕایەوە[2]، ئەڵبەتە زۆرێک سەرچاوەی عربی باس لەو ڕاستیە دەکات، هەندێکیان هەلدەبژێرین:

أ- سەرچاوەی گەورەی میسر بە ناوی (الجغرافيا السياسة)[3] دەڵێ: کوردەکان لە کۆنەوە ولاتیان هەبووە پایەتەختەکەی ئەرابخا (کەرکووکی ئێستا) بووە.

ب- هەریەکە لە سەرچاوەی مێژوویی هاوچەرخ کە بەدەستی عەرەب نووسراب زۆر هەیە ئەو ڕاستیە دەدرکێنی بەڵام زیاتر ئەوانەی

---

١. جاران هەندێ سەرچاوە بە کەنداوی عەجەمیان دەوت (هرمز).
٢. تەنها لە ئێران ئوستانێک بەناوی کوردستان هەر ماوە.
٣. عدد من الأساتذة المختصين، الجغرافيا السياسية، ١٩٦١، ص٤٥٨.

PDF 4 KURD

مەیلی ئاینیان زاڵە بەسەر عروبیدا، بۆیە هەوڵدەدەین لەوانی تر هەڵبژێرین، یەکەمیان: (قاموس السیاسي، احمد عطیةالله) لە بابەتی کوردستان لە لاپەڕە (٩٦٨) شارەکانی کوردستانی ڕیزکردوە کەرکووک سێیەمە.

پ- الموسوعة العربیة العالمیة: لە بارەی کرکوك:..تعد کرکوك رابعة کبری مدن العراق، حیث بلغ عدد سکانها (٩٠٠,٠٠٠) نسمة في عام (١٩٩٣م)، تعد کرکوك عاصمة المجموعات الکردیة في شمال العراق.

ت- عەبباس عەزاوی لە کتێبی (تاریخ الکاکائیة) لە مێژووی هاتنی ئیسلام بۆ ئەو ناوچە کەناوی کەرکووك دەهێنی بە (کەرخینی) دەڵێ سەر بە (بلاد کردستان).

ج- مەحموود شاکر لە (تاریخ الإسلامي ج١١، ص٨٧)دا دەڵێت تەقەلای کورد بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی لە شارەکانیان (موصل، اربیل، سلێمانیة، کرکوك، دیالی).

ح- عەبدولڕەحمان بەزاز سەرۆك وەزیرانی عێراق لە کتێبێکی (العراق من الإحتلال الی الإستقلال، ص٢١٨) باس لە یاسایەك دەکات بە ناوی (قانون اللغات/ عام١٩٣١) لە ماددەکانی (٢ و ٦)دا باس لە زمانی کوردی فەرمی بۆ خوێندن لە شارەکانی کرکوك و هەولێر و سلێمانی، لە ماددەی (٨)یش وەك ماددەی (١٤٠)ی ئێستا ماوەی ساڵێکی بۆ دانرا تا ڕاپرسی بکەن لە شارۆچکەکانی موسڵ ئاخۆ کام زاراوەی کوردی و کام زمانیان دەوێت.

## ٧. کوردستانێتیی ئەو ناوچەیە لە بەڵگەنامە بەریتانییەکان:

ا- (دائرة معتمد السامي البریطاني -البلاد ما بین النهرین- ٨٧٣٥ بغداد ١٩٢١/٦/١.. لەم ڕاپۆرتە باس لە دیاریکردنی سنووری ئەو دەوڵەتەی

PDF 4 KURD

بەناوی (العراق العربي) دەکات کە بەریتانیا بە نیازە درووستی بکا، دەڵێ شارەکانی کەرکووک و کەلار و کفری عەرەب نین، بەڵام (١٠٠%) کوردیش نین.

ب- نامەی میس بیل (سەبارەت بە هەڵنەبژاردنی مەلیک فەیسەڵ لە کوردستان) زۆر بە ڕوونی کوردستانێتیی ئەو ناوچە دەردەکەوێ، میس بیل لە نامەی ڕۆژی (١٩٢١/٨/١٤) بۆ بەریتانیا (العراق في الرسائل مس بيل) هۆی ئەو پرسەی ڕوونکردۆتەوە دەڵێ:زۆربەی ناو کەرکووک تورکمانن و گوندەکانی دەوروبەریش هەموی کوردن، هەردووولا داوای دەوڵەتێکی کوردیان کرد لەژێر چاودێری ئێمە، تەنها دووگەڕەک لەناو کەرکووک داوای گەڕانەوەی عوسمانیان کرد[1]. ئاماژە بە هیچ عەرەب ناکا.

ت- الوثائق السرية - بغداد (١٩٢٩/٤/٢٣) من همفريز مندوب السامي البريطاني... لەو بەڵگەنامەیە باسی بارودۆخی کوردستان دەکا و دەڵێ بەشی زۆری دانیشتوانی کەرکووک کوردن، باس لەو ناوچەیەی ئێستا ناوینراوە (مناطق متنازع عليها) دەکا داوا دەکا زمانی فەرمی ئەو ناوچەیە کوردی بێت چونکە کوردن، لە کۆتایی بەڵگەنامەکە خشتەکێکی دانیشتوانی کەرکووکی داوە: (٤٩%)ی کوردن، دەرەوەی موسڵ (٧٠%)ی کوردن، کورد لە کەرکووک (٦٧٧٠٢) کەس، تورکمان: (٢٨٧٤١)، عەرەب: (٢٦٥٦١)، یەهوودی: (٨٤٧٢)، مەسیحی: (١٢٢٨) کەس.

---

١. العراق في الرسائل مس بيل، ص٣٣٥.

PDF 4 KURD

**٨. کوردستانێتیی ئەو ناوچە لە ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ:**

(تقرير لجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع التركي البريطاني حول ولاية الموصل):

أ- لە لاپەڕە (٢٢٣)دا هاتووە: سنووری کورد و عەرەب لە پێکگەیشتنی زاب و دیجلە بەرەو کفری دەڕوا، بەو شێوەیە و موسڵ لە عەرەب جیادەبیتەوە، هەر لە لاپەڕە (٢١٩)دا دەڵێ: عێراق هیچ مافێکی لەو ناوچەیە (ویلایەتی موسڵ) نییە و ناوی عێراقیان هەر نەبیستوە، لە لاپەڕە (١٥٣)دا دەڵێ نێوان موسڵ و بەغدا هیچ ناوێکی دیاریکراوی نەبووە، لە لاپەڕە (٢١٨) ڕاستەوخۆتر دەڵێ ویلایەتی موسڵ کوردیە، هەرلەو ڕاپۆرتە لە لاپەڕە (١٥٩) باس لەوە دەکا کە لە سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی (١٥٣٤) و دواتریش بەغدا و موسڵ و کەرکووک بە ویلایەتی شارەزوور ناوزەددەکرا.

ب- پاساوی تورکیا ئەوە بوو کە سنووری نێوان کورد و عەرەب هێڵێکی ڕوونی سروشتی و جوگرافی هەیە کە ویلایەتی موسڵیش لە عێراق جیادەکاتەوە ئەویش بریتیە لە هێڵی: ڕووباری دیالە - جەبەل حەمرین - جەبەل مەکحوول (فوهول) -وادی سەرسار (ثرثار) - جەبەل سنجار (شنگار)[1].

پ- بەریتانیا لە بەڵگەکانی دژ بە تورکیادا دژ بەکوردیش بووە بەڵام بۆ ئێستا بوویتە بەڵگە لەوانە لە (پرسی ناوی عێراق) دەڵێت

---

١. تقرير ولاية الموصل، ص٥٩.

PDF 4 KURD

شەهرەزوور هەریەکە لە کەرکووک و ڕانیە و هەولێر و ڕواندوز و کۆیە و کفری دەگرێتەوە[1].

ت- لە لاپەڕە (٦٨)دا تەواوی ویلایەتی موسڵی خستۆتە سەر هەرێمی جەزیرەی کورد، بە پشتیوانی نەخشەی نەسرەدین تووسی (١٢٦١ز)، لەو نەخشەدا موسڵ و هەولێریشی خستۆتە سەر هەرێمی جەزیرە.

ج- ڕوونترین ئاماژەی ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ سەبارەت بە کێشەی کەرکووک دەڵێت توزخورماتووش کوردستانە، واتە زۆر لە خوارووی کەرکووکیش، ئاماژە بە کفری دەکا دەڵێ سەر بە عێراقە.. بەڵام ئەوە بەڵگەی بەریتانیە[2].

چ- بەریتانیا گەڕاوە چاکترین نەخشە بدۆزیتەوە لە قازانجی عێراق کەچی لە بارودۆخی ئێستای کوردستان بەکەڵکە، ئەتڵەسێکی ئینگلیزی بەناوی (ئەتڵەسی تایمز) دانەری (بارسۆلۆمبەر) لە (١٩٢٠) دانراوە سنووری خوارووی کوردستان ئاوا دەکێشێ: لە جەزیرەی ئیبن عمرەوە بە درێژای ڕووباری دیجلە ڕۆژئاوای دهۆک بۆئەلقۆش - تلکیف - ئاڵتون کۆپری - ڕۆژئاوای کەرکووک - تاوق - بەرەو خواروو[3]، ئینجا نالێ ئەو بەری ئەو سنوورە عێراقە بەڵکو دەڵێ میزۆپۆتامیایە.

ح- لە گەرمەی کێشەکە (فەتحی بەگی نوێنەری تورکیا) بە هاوارەوە ڕوو لە ئینگلیز دەکا و دەڵێ ئەگەر ڕاستی بڵێین ویلایەتی موسڵ ناوچەیەکی کوردیە[4].

---

١. تقرير ولاية الموصل، ص٦٧.

٢. تقرير ولاية الموصل، ص٧٢.. لە (ص٥٥ -٨٠) بریتین لە بەڵگەی بەریتانی کە لە قازانجی عێراقی و عەرەبە کەچی بەکارمانهێناوە.

٣. تقرير ولاية الموصل، ص٧٩.

٤. تقرير ولاية الموصل، ص٢١٨.

PDF 4 KURD

## ٩. کوردستانێتیی ئەو ناوچە لە ئامارەکان:

***یەکەم: ئاماری پێش تەعریب:***

کێشەی ئاماری پێش تەعریب[1] دووانە، یەکەمیان لەو سەردەمی واتە پێش (١٩٢١) ئامار لەسەر بنچینەی نەتەوەیی نەبووە، زیاتر ئاینی و تایفی بووە، بۆیە لە سەردەمی عوسمانی لە (دائیرەی ڕەگەزنامە) لە ناسنامە ناوی نەتەوە تۆمار نەدەکرا، تەنانەت لە دوای ئینقلابی ئیتحادولتەرەقی (١٩٠٨)ی تورکخوازی تەنها ئەوە زیادکرا بە هێما بەرامبەر ئەفسەری کورد پیتی (ک) تۆمار دەکرا، بۆ عەرەب(ع)... دووەمیان خەڵکی کورد لە ئامارەکان ئافرەتانیان نەدەنووسی و گەنجانیشیان نەدەنووسی لەبەر سەربازی، بۆیە ئاماری پێش تەعریبمان کەمە و تەواو درووست نییە بەڵام دیسان بەڵگەنامەی بەهێزە:

أ- ئاماری بەڵگەنامەکان: الوثائق السرية- بغداد (١٩٢٩/٤/٢٣) من همفريز مندوب السامي البريطاني... لە کۆتایی بەڵگەنامەکە ئامارێکی لە شێوەی خشتەکێکی دانیشتوانی کەرکووکی داوە: (٥.٤٩%)ی کوردن، کورد لە کەرکووک (٦٧٧٠٢) کەس، تورکمان: (٢٨٧٤١)، عەرەب: (٢٦٥٦١)، یەهوودی: (٨٤٧٢)، مەسیحی: (١٢٢٨) کەس. لە ئامارێکی (عصبة الأمم) تێکڕای کوردی لە کەرکووک بە (٦٣%)ی قەبڵاندوە.

ب- ئاماری گەڕیدەکان: (ئۆلیڤەر-١٨٩٠) دەڵێت: موسڵ (٢٥٠٠٠) عەرەب و (١٧٠٠٠) کورد و (١١٠٠٠) تورکمان و (٨٠٠٠) مەسیحی و (١٠٠٠) یەهوودی لێیە.

---

[1] تەعریب لە سەردمی کێشەی ویلایەتی موسڵ (١٩٢٣) دەستپێدەکا، هەرچی بەتورککردنە لە ساڵی (١٩٠٨)ەوە دەستپێکردوە.

PDF 4 KURD

پ- ئامارێک لە لایەن (دائرة لواء كركوك) پاش جەنگی جیهانی یەکەم کراوە محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە یاداشتەکەی بۆ مەلیک فەیسەڵ لە (٢٠/کانون یەکەم/١٩٣٠) ناردوە بەو شێوەیە: کورد (٥١%)، تورکمان (٢١,٥%)، عەرەب (٢٠%)، مەسیحی (٧,٥%).

ت- ئامارێکی حکومەتی سوید کە بە (عصبة الأمم) دراوە لە بارەی دانیشتوانی کەرکووک سەرجەمی (١٢٢٢٠٠٠) کەس بەو شێوەیە[١]: عەرەب (١٠٠٠٠) کەس، تورکمان (٣٥٠٠٠) کەس، کورد (٧٥٠٠٠) کەس، کلدان (٦٠٠) کەس، یەهوودی (١٤٠) کەس.

ج- ئاماری لێژنەی ویلایەتی موسڵ، زۆر جۆرە ئاماری بەریتانی و تورکی و مێژوویی دراوە، ئەوەیان نزیکە لە ڕای لێژنەکە: (٤٧%)ی کورد، (٣٥%)ی عەرەب، (٢٦%)ی تورکمان[٢].

***دووەم: ئامار پاش تەعریب:***

أ- ئاماری (١٩٥٧) لە کەرکووک ڕێژەی کورد = (٣ر٤٨%)، (٢ر٢٨%)ی عەرەب، (٥ر٢١%)ی تورکمان، مۆرکی تەعریبی بە ئاشکرا پێوە دیارە، زیاتر لەوەش بابڕوانینە ئاماری ١٩٧٧: کورد = (٣ر٣٧%)، تورکمان= (١٣ر١٦%)، عەرەب بەرزبوویتەوە بۆ (١٤ر٤٤%).

ب- خوێندکارانی ساڵی (١٩٦٠): لە بەڵگەنامەیەکی پەروەردەی کەرکووک (تقرير صادر عن لجنة تثبيت المدارس الكوردية في لواء كركوك) کە بە فەرمانی "ژ: ٣٦٣١ لە ١٩٦٠/٣/١٤ (مديريه معارف لواء كركوك)" دەرچووە بەو شێوەیە: الكورد: (١٣٦٣٣) التركمان: (١٢٤٠٤) العرب: (٦٥٧١).

---

١. لە کتێبی (منطقة كركوك و محاولات تغيير واقعها القومي) وەرگیراوە.

٢. تقرير ولاية الموصل، ص١٩٨-١٩٩.

PDF 4 KURD

پ- الوثائق السرية البريطانية - بغداد (١٩٢٩/٤/٢٣)... لە کۆتایی بەڵگەنامەکە ئامارێکی دانیشتوانی کەرکووکی داوە: (٤٩%) کوردن، دەرەوەی موسڵ (٧٠%)ی کوردن، کورد لە کەرکووک (٦٧٧٠٢) کەس، تورکمان: (٢٨٧٤١)، عەرەب: (٢٦٥٦١)، یەهوودی: (٨٤٧٢)، مسیحی: (١٢٢٨) کەس[١].

## ١٠. کوردستانێتیی ئەو ناوچەیە لە ڕێککەوتنە نێودەوڵەتیەکان:

أ- کوردستانێتیی ئەو ناوچەیە لە ڕێککەوتنی بەدلیسی - سوڵتان: ئەو ڕێککەوتنە لە (١٥١٤) لە نێوان (٢٣) میرنیشینی کوردی و سوڵتان سەلیم بە سەرپەرشتی شێخ ئیدریسی بەدلیسی ئەنجامدرا، ڕێککەوتنەکی چڕکراو لە (٥) ماددە[٢]، گرنگیی ئەو ڕێککەوتنە بۆ ئەو بابەتەی ئێمە لەوە دایە کە شێخ ئیدریس هاتووە گەڕاوە بەناو میرنشین و دەسەڵاتدار و سنووری کوردستانی پێ دیاریدەکری. ئەرشاک سافرستیان دەڵێ: لە میانەی گەڕانیدا هاتۆتە کەرکووک و

---

١. الوثائق السرية، بغداد (١٩٢٩/٤/٢٣) من همفريز مندوب السامي البريطاني.

٢. لە کانوونی یەکەمی (١٩١٨) سورەییا بەدرخان ناوەڕۆکی ئەو ڕێککەوتنەی لە نامەکەیدا بەناوی (کۆمیتەی ئیستیقلالی کورد) بۆ بەریتانیا دەرخستوە، کە کورد بە ئارەزوویان خۆی ئەو ڕێککەوتنە چاکەیان لەگەڵ سەلیم مۆرکردووە، ئەو ڕێککەوتنە (لەگەڵ هەوراز و نشێویش) تا سەرەتای سەدەی (١٩) بەردەوام بوو، لە ڕاپۆرتی بەریتانی - کۆلۆنیل ئیفلینستۆن هاتووە و دەڵێ: ئەو ڕێککەوتنەی کورد و عوسمانی تا ساڵی ١٨٢٦ی خایاند، بووە هۆی دروستبوونی ١١ ئیمارەتی تر.

دیالـه و ئـەو ناوچەیـە و خوارووشـی[1]، واتـە دەسـەڵاتی کـوردی لـەو کاتی لەو ناوچە بە ئاسایی هەبووە، عەباس عـەزاوی لـە (العـراق بـین الإحتلالین) هەمان زانیاری دەدا.

لـە دوای ئـەو ڕێککەوتنامەیـە زولفیقـار بـن علـی بـەگی کـورد بەغدای داگیرکرد لـە (١٥٢٧)[2] پـێش عوسـمانی، دوای لـە (١٥٣٤/١٢/٣١) لـە بەغدا کوژرا، بەڵام لەگەڵ داگیرکردنەوەی بەغدا لە لایەن عوسمانیەکان دیسـان دەسەڵاتی کورد (ئەردەلان) گەڕایەوە تا نزیـک بەغدا، کـەرکووک بـوو بـە مەڵبەندیان لە شارەزوور، لەسەر ئـەو بنچینەیـە (گرایمـەر) و (تومـا بـوا)[3] لە (دائیرەی مەعـاریفی ئیسـلامی) دەڵێن: ناوچـەی کـەرکووک هـەر لـەژێر دەسەڵاتی گەورە کوردەکان بووە.

ب- لە ڕێککەوتنی ئـەرزەڕۆم کـە لـە (١٨٢٣/٧/٢٨) بەسـترا، پێکهـاتووە لـە (٧) بـەش- لـە بەشـی یەکـەم بـاس لـە کوردسـتان دەکـات و دەڵـێ سنووری دەگاتە نزیک بەغدا[4].

---

١. ئەرشاک ئەفراستیان، کورد و کوردستان، ص٣٩-٤٠.

٢. لە هەندێ سەرچاوەی تر باسی ئەو داگیرکردنە لـە سـاڵی (١٥٢٧ز)ـدا دەکـەن و لە (١٦٣٣) فارسەکان دەریانکردوە لە (١٦٣٨) جارێکی تر عوسمانی گرتیانەوە.

٣. دائرة المعارف الإسلامية (فەڕەنسی)، ج٥، ص١٤٧.

٤. جوگرافیناسی گەورەی ئیسلامی ئیبن حۆقەل لە سـەدەی (١٠) لە موسڵ بووە دەڵێ: موسڵ ئاو و هەوایـەکی خـۆش و بـازاڕێکی گـەرمی هەیـە و زۆربەشـیان کوردن. هەرچی قاموسی عوسمانیە لە قاموس الاعلامي شـمس الـدین سـامي و هەروەها لە (مادەی کوردستان) و (مادەی ویلایەتی موسـڵ) دەڵـێ: خەڵکەکـەی زۆری عەرەبن بەڵام هەرێمەکە پارچەیەکە لە کوردستان. بۆ ئەو مەبەسـتە و زیاتر بڕوانە: کورد و کوردستان لە یەکەم ئەنسیکلۆبیدیای عوسمانی، ص٣٠٧.

PDF 4 KURD

پ- سنووری خوارووی کوردستان لە ماددەی (٦٢)ی سیڤەر، سنوورەکە دیاریکراوە و بریتییە لە ڕۆژهەڵاتی فوڕات، وا دیاریکراوە: [بریتییە لە ڕۆژهەڵاتی فوڕات و باشووری ڕۆژئاوای سنووری ئەرمینیا کە لە دوای ئەوەش دیاریدەکرێ، لەسەرووی سنووری تورکیا و سوریا و میزۆپۆتامیا کە لە پەرەگرافی (٢)ی ماددەی (٢٧) دەستنیشانکراوە].

ئەو سنوورە هەر لە خۆڕا نەبوو، ئەوکاتی زۆربەی پرۆژەکانی باسی سنووری کوردی دەکرد باسی لە فوڕات کردوە، لە پرۆژەکەی (مستەر ڤانیستارت) بۆ کیرزۆن ئینجا ئەویش بۆ ئەنجومەنی وەزیران لە مانگی (١٩٢٠/٤)، لە کۆنگرەی سان ڕیمۆش سنوورەکە هەر فوڕات بووە، لە کۆنەوە ئەوناوچەیە بەلای کەم تا فوڕات کورد بووینە یاقووتی حەمەوی (١١٧٨ز) لە (ج١معجم البلدان - باب في صفة الجبال...) تەواو وەسفی ئەوبەری فوڕات بە (برية العرب) دەکا، بۆیە لە کێشەی سنووری عێراق لەگەڵ سعودیە داوای ئەو ناوچەیەی دەکرد تا فوڕات، دوای بە فشاری (برسی کۆکس) سعودیە وازی لەو داوایە هێنا و لە (٥/٥/ ١٩٢٢) لە محەمەرە ڕێککەوتن.

ت- کوردستانێتیی لە کۆنگرەی قاهیرەی (١٩٢١/٣/٢٤): ئەوکۆنگرەیە بۆ دروستبوونی دەوڵەتی عێراقی بوو، میجەر نۆئیل سنووری کوردستانی بۆ کۆنگرەکە ڕاڤە کرد و سنووری خوارووی بە جەبەل حەمرین تۆمارکرد. لە کۆتایی کۆنگرەکە هەر پاڵپشت بەو سنوورەی ماددەی (٦٢)ی سیڤەر کرا، چەرچڵ خوارووی کوردستانی هێشتەوە بە هەڵپەسێردراوی نەیخستە سەر عێراق وەک (برسی کۆکس و مس بیل و ویلسۆن) دەیانویست.

ج- لە سایکس بیکۆش سنووری عێراق بەلای ئەوناوچانە نەهات.

## ١١. کوردستانێتیی ئەو ناوچە بە پێی یاسا:

هەموو ئەو بەڵگەنامە مێژوویی و جوگرافی و زانستی و سیاسیانە زەمینەی یاسای کوردستانیبوونی ئەو ناوچانە دەگەیەنن، سەرەڕای ئەمانە هەندێ ڕەهەندێ یاسایی تریش هەیە:

أ. بەڵگەنامەیەکی یاسایی بنچینەیی بۆ ئەوتوێژینەوە ئەوەیە کە لە کۆتایی دەرەنجام و بڕیارەکانی لێژنەی نێوبژیوانی کێشەی ویلایەتی موسڵ هاتووە (ليس للعراق حق شرعي أو حق الغلب على تلك الاراضي) بەکوردیەکەی دەڵێ: هیچ عێراق مافێکی لەو ناوچەیە نییە.

ب. وەک دەزانین وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە پێی ڕێککەوتنی سیڤەر درووستبوونە، کەرکووک لەسەر میلاکی عێراق لە عوسمانلی جیانەبۆتەوە، واتە بە پێی ماددەی (٩٤)ی ئەو ڕێککەوتنە جیانەبووە، بەڵکو کەرکووک لەسەر میلاکی کوردستان جیا کراوە بە پێی ماددەی (٦٢) بوو.

پ. لە کۆتایی جەنگ (١٩١٨) دیسان عەلی ئیحسان پاشا (نوێنەری سوڵتان) بە بروسکەی ڕۆژی (٣٠/تشرینی یەکەم/١٩١٨) حکومەتی شێخ مەحموودی بە ڕەسمی بە میراتگری عوسمانی لە ناوچەکەدا ناساند، کەواتە ئەو ناوچەیە بە شەرعی میراتی شێخ مەحموودە مادام دەسەڵاتێکی شەرعی وەک عوسمانی ئەو ناوچەی بە فەرمی پێداوە و بەکەسی تری نەداوە، نە لەسەر ئاستی کەسێتی نە لەسەر ئاستی هەرێمی و نێودەوڵەتی.

PDF 4 KURD

**١٢. کوردستانێتیی کەرکووک لە (١٠) بەڵێننامەکەی (١٩٣٢):**

بـۆ ئـەوەی عێـڕاق لـە عوسـبە وەرگیـرێ (١٠) بەڵێننامـە لـە عێـڕاق وەرگیـرا، لـە بەڵێننامـەی (ژ:٩) لقـی (١) دان بـەوە دەنـی کـە کـەرکووک زۆرینە کوردە.

**١٣. کوردستانێتیی ئەوناوچەیەلە شیعر و ئەدەبیاتدا:**

شیعری قانیع:

بەڵی سنووری بەبێ زیاد و کەم

بۆت بەیاندەکەم بەبێ دەرد وخەم

بە پێی نووسینی جوگرافیاکان

تەرەفی غەربی بۆت ئەکەم بەیان

لە کێوی تۆروس تا ئەسکەندەروون

هەتا بەحری ڕەش بێ چەند و چوون

تەرەفی شیمال هەر لە بەحری ڕەش

هەتا ئەردەهان بەبی غەل وغەش

لە ئاردەهان بۆ ئاوی ئاراس

ئەمە شیمالە بە عیلمی قیاس

تەرەفی شەرقی لە کێوی ئەلوەند

تا گۆلی ورمێ بەبێ چوون وچەند

لە کێوی ئەڵوەند تا جەبەل حەمرین

ئەهواز وشەنگار پارچەی نەسیبین

ئەمە جنووبە چاکی بزانە

ناو ئەو سنوورە خاکی کوردستانە

PDF 4 KURD

لە شیعرێکی تری حاجی قادری کۆیی ئەو سنوورە وا هاتووە:

کوردە دەزانی لە کوێ ساکینە خزمانی تۆ

گوێ بگرە تا بۆت بڵێم مەسکەنی قەومانی تۆ

کێوی تووروس و عومقی حەوزەیی ئەسکەندەروون

غەربیە تا بەحری ڕەش سەرحەدی بە مەیدانی تۆ

بەحری ڕەش و ئەردەهان ئاوی ئاراز لێ بزانن

حەددی شماڵە کۆچەری بێ جەولانی تۆ

ئەڵوەند و گۆلی ورمێ تا سەری ئاوی ئاراز

سەرحەددی ڕۆژهەڵاتی جۆگە و مەیدانی تۆ

ئەهواز و کێوی حەمرین و ژەنگار و نەسیبەین

بۆ جنووبە ڕەوزەیی ڕیزوانی تۆ

داخلی ئەم حدودە (١٢) ویلایەت هەیە

دەڵێن (١٢) ملیۆنە نفووسی کوردانی تۆ

## ١٤. کوردستانێتیی ئەو ناوچەیە لە زاری عێراق خۆی:

أ. بەڵگەی هەرە کۆتایی ئەوەیە خودی مەلیک فەیسەڵ (مەلیکی عێراق) لە کۆنگرەی سیڤەر (١٩٢٠) ئامادەبوو، وەفدی کورد لەوێ نەبوو، مەلیک مۆری کرد کە سنووری کوردستان لە ڕۆژهەڵاتی فوراتە و لە ماددەی (٦٢)ی تۆمارکرا کە هەموو ئەوناوچە جێناکۆک و بەسەدان کیلۆمەتر زیاتر دەگرێتەوە[1].

---

١. بڕوانە: دەقەکانی سیڤەر و خوێندنەوەیەکی تر، پ. ی. سەلام ناوخۆش و مەسعوود عەبدولخالق.

PDF 4 KURD

ب. لــه هــەڵبژاردنی مــەلیک فەیســەڵەوە: زۆر بــە ڕوونــی ســنووری کوردستان لەو ڕاپرسیە دەردەکەوێ، لە کوردستان دەنگیان پێ نەدا، لە سلێمانی هەوڵدرا ئەو بەشداری نەکردنەی خەڵکی بەوە بشارنەوە کـە هـەر کەسـێ خانووەکـەی لـە (٢٠٠٠) ڕوپیـە کـەمتر بێـت نـابێ بەشداری ڕاپرسی بکا، لە هـەموو سلێمانی مـەلیک فەیسـەڵ و دەنگ بـە عێراق (٣٢)ـی دەنـگ بـوو، لـە کـەرکووکیش تـەنها (٦٤)ـی دەنگی هەبوو (١٩٧)ی دەنگی تر بە مەرجی مافی کورد وەک لە مەرجەکانی ڕاپـۆرتی ویلایـەتی موسـڵ هـاتبوو، تورکمـانیش لـەوێ هەلوێسـتیان باش بوو دەنگیان بە مـەلیک فەیسـەڵ و عێراق نـەدا، هەیە وادەزانی لەبەر تورکیا بـوو... لـە ڕاستیدا ئـەوە لەگـەڵ ڕاپرسـیەکەی ویلایـەتی موسـڵ جیـا بـوو، پەیوەنـدیی بـە تورکیـا نـەبوو ئینجـا تورکمـانی کوردستان لەگەڵ عوسمانی تەبا نەبوون.

پ. برسـی کـۆکس* (حـاکمی بـەریتانیا لـە عێراق) بـەنووسـراوی فـەرمی (ژ:٤/٣٣٣٠)ـی (١٩٢١/٢/٢٢) دەنێری بۆ حکومـەتی تـازەی عێراقی و فەرمانیان پێدەکا کوردستانی خواروو بخەنە سەر عێراق، ئەوبڕیارە تـا دوای چارەسـەری کێشـەی ویلایـەتی موسـڵ ئینجـا جێبـەجێ کـرا، کەرکووکیش وەک باقی شارەکانی کوردستان تا ساڵی (١٩٢٥) ئاڵای عێراقی لێ هەڵنەدرا.

ت. مـس بیـڵ ناوبـانگی هەیـە وەک کـۆکس دژ بـەکوردە، لـە نامـەی (٢٩/ئایــار/١٩٢١) و نامــەی (١٩٢١/٦/٥) بــۆ وەزارەتــی دەرەوەی

---

* - هەریەکە لە برسی کۆکس و مس بیڵ و زۆری تر لەسـەر زاری عێراق حساب دەکرێت چونکە ئەو کاتی ئـەوان عێراقیان بە ڕێوەدەبرد، بگرە لـەوەش زیاتر هەر ئەوان عێراقیان دروستکرد.

PDF 4 KURD

بەریتانی باس لە سەفەرەکەی بۆ سلێمانی و کەرکووک دەکا کە لە کتێبەکەی (العراق في الرسائل المس بیل، ص٢٩٢-٢٩٣) بڵاوکرایتەوە، دوو ئاماژەی ڕوونی یاسایی و سیاسی تێدایە: یەکەمیان دەڵێ (ان اهالیها اکراد کلهم) ئەو ناوچانە هەمووی کوردن. دووەمیان لەو کاتی ئەو سەفەرەی لە بەغداوە بۆ کەرکووک و سلێمانی بەسەفەر بۆ (خارج- واتە خارجی/دەرەوەی عێراق) وەسفکردوە.

ج. لە (١٩٢٩/٢/٨) شەش پەرلەمانتاری کورد یاداشتێکیان پێشکەشی پەرلەمانی ئەوسای عێراق کرد داوای زیادکردنی بودجەیان بۆ ناوچە کوردیەکان کردوە، تێیدا ناوی شارەکانی کوردی تاوتوێکراوە لە نێوان هەردوولادا: کە بریتی بووە لە: سلێمانی و کەرکووک و هەولێر و بەشێکی موسڵیش. لەسەر ئەو بنچینە لە ساڵی (١٩٤٣) نوری سعید و مەلا مستەفا ڕێککەوتن کە: ویلایەتێکی ئۆتۆنۆمی پێک بێت بۆ کورد لە کەرکووک و سلێمانی و هەولێر و هەندێ شارۆچکەی موسل تێیدا[١].

## ١٥. کوردستانێتیی ئەو ناوچە لە سکاڵانامەکان:

أ. نامەی شێخ عەبدولقادر شەمزینی لە (١٩٢٠/٦/٢٥) بۆ کۆمیسەری بەرزی فەرەنسا تێیدا ئاماژەی بە سنووری کوردستان کردوە کە بەڕوونی کەرکووک و موسڵ دەگرێتەوە. ئەم بەڵگەنامەیە لە (١٧/جولای/١٩٢٠) لە ئەرشیڤی فەرەنسا هەڵگیراوە.

ب. نامەی سەرکردایەتیی کۆمەڵەی ئیجتماعی کورد (مەمدووح سالم و ئەمین عالی بەدرخان..) لە (١٩٢٠/٦/١٧) بۆ کۆنگرەی ئاشتی کەوا

---

١. تاريخ الإسلامي، ج١١، ص٨٧ و ٨٩.

PDF 4 KURD

نارەزان بەرامبەر ئەو سنوورەی لە ماددەی (٦٢)ی سیڤەر هاتووە و ڕۆژهەڵاتی فوراتی بەسنوور داناوە کە موسڵ و هەموو ئەوناوچانەی ئێستا پێی دەگوترێ ناکۆکان دەگرێتەوە، کەچی لەو سکالایە بەوە نارازین دەڵێن لە دیوی ڕۆژئاوای فورات و خوارووتریش کوردستانە.

پ. لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی عێراق (لەسەرەتای سەدەی بیستەم) نامەی سورەییا بەدرخان بۆ سەرۆکی کۆنفرانسی ئاشتی، سنووری خوارووی کوردستانی لەسەر هێڵی (٣٤) دیاریکردوە[1]. لە نامەیەکی تری لە ئەرشیڤی فەرەنسا (E٢١٢٧) لە (١٩٢٠/٣/١٤) هەمان ئاماژەی تێدایە. نامەیەکی تریشی لە ئەرشیڤی بەریتانی (FO ٦٠٨/٩٥) لە (٧/کانونی یەکەم/١٩١٨) بۆ کۆمیسەری بەرزی بەریتانیا لە میسر.

ت. نامەی ئەمین عالی بەدرخان بۆ سەرۆکی ئەنجومەنی بالای کۆنفرانسی ئاشتی لە (١٩٢٠/٣/١٨ -٢٧٥) / (m/559 NO) تێیدا باسی ویلایەتەکانی (بەتلیس و وان و موسڵ و دیاربەکر)ی وەک کوردستانی باسکردوە.

ج. نامەی تۆفیق وەهبی (٢٣/مارس/١٩٣١) بۆ کۆمیسیۆنی ئینتداب دەڵێ لە کەرکووک تەنها چەند خێلێکی عەرەبی لێیە ئەوی تر کوردن.

هەموو ئەم یاداشت و نامانەی سەرەوە لە دانیشتنی ژمارە (٢٠)ی لیژنەی ئینتدابی بالا لە دانیشتنەکانی (ژ:٤٢٢- ١٩٣١/١٦٥) هەروەها

---

١. بەڵگەنامەی بەریتانی و فەرەنسی (ژ: ٢٣) لە کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردیەکان لە بەڵگەنامەی بەریتانی و فەرەنسی.

PDF 4 KURD

(BB220) و (CB1198) تاوتوێکراو بەرزکرایەوە بۆ (عصبة الأمم) بە پێی بەڵگەنامەی عوسبە (140)CBM1 و (١١٥١) لە (١٩٣٠/٨/٢٤)[١].

## ١٦. کوردستانیەتی ئەو ناوچە لە کاتی داگیرکردنی عێراق:

أ. بروسکەی چەرچل بۆ مەلیک فەیسەڵ: (اننا وعدناك بتأسيس دولة عربية و ليست امبراطورية، لذلك ان حدودك لن تتجاوز جبل حمرين الى ما ورائه فهو كوردستان..)[٢].

ب. لە یادەوەریەکانی ڕۆژی (١٤/ ٣/١٩١٥)ـی سیەر ئەرسەر هێرتزل دەڵێ کاتی سوپای بەریتانی سەرکەوتنی بەدەستهێنا و لە (١٩١٧) بەغدای گرت بەرەو سەروو چوو، بەبروسکە ئاگادارمان کردنەوە کە لە (جەبەل حەمرین) نەپەڕنەوە با تووشی ڕووبەڕووبوونەوە نەبن لەگەڵ کورد[٣].

پ. پرۆژەی نۆئیل بۆ دروستکردنی کۆنفیدڕالیەکی کوردستان بۆ (٣) بەش یەکەمیان کوردستانی خواروو مەڵبەندەکەی لە سلێمانی بێت، موسل و دیاربەکریش هەریەکە مەڵبەندی کوردستانی ڕۆژئاوا و سەروو بێت[٤].

---

١. ئەو بەڵگەنامەی سەروو لە کتێبی (المشكلة الكردية في الشرق الأوسط، ص٤٦٠) وەرگیراوە.

٢. الإسلام والعلمانية و أثرهما في نشأة الدولة العراقية، ص٢١٨.

3 .Briton Cooper Bush, Britain, India and Arabs, P.40; & Marian Kent, Oil and Empire, P.120.

٤. سياسة البريطانيا العظمى...، ص١٤٢.

PDF 4 KURD

## ١٧. کوردستانێتیی ئەو ناوچەیە لە ڕووی سایکۆلۆژیەوە:

تا ئەو ساتە و لە کاتە هەرە سەخت و شلۆقەکاندا نە حکومەتی عێراقی نە بەعس نە شۆڤێنیەکانی ئێستا لە ڕووی سایکۆلۆژیەوە زات ناکەن بڵێن ئەو ناوچەیە عەرەبیە، یان کوردستانی نییە، بەڵکو دەڵێن عێراقیە، ئەمەش چەمکێکی فراوانە هەولێر و سلێمانیش دەگرێتەوە، لە مێژوودا یەک بەڵگە نییە کێشە لە نێوان کورد و عەرەبدا هەبووبێت لەسەر ئەوناوچە یان لە بەڵگەیەکدا هەبووبێت کە داوای ئەو ناوچەیان کردبێت یان حوکمیان لێ کردبێت.

## ئەنجام

مادام کوردستان هەرێمێکی یاساییە لە چوارچێوەی عێراقدا، ئەوا دیاریکردنی سنوورەکەشی دەکەوێتە پرۆسەیەکی یاسایی، بۆ دیاریکردنی ئەو سنوورە زۆر بە ڕوونی و بێ تەومژ دەرکەوت: ئەو ناوچانە بە هەموو پێوانەیەکی مێژوویی جوگرافی و دیموگرافی و یاسایی و شەرعی کوردستانییە، بەڵام دەستی بەسەردا گیراوە نۆرەی چارەسەرییە.

### چارەسەری

ئەو کێشەیە ئەوەندە سادە نییە و هەر تەنها زادەی سیاسەتی بەعس نەبووە، بەڵکو قووڵدەبێتەوە بۆ کێشەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و پرسی میراتی ئیستعماری، ئەو هۆکارانەی پرسی تەواوی کوردستانی گەورەی ئاڵۆزکردوە هەمان هۆکار و هۆکاری سەرباری تریش هەیە، هۆکارە سەربارەکانی وەک ئەوەی لەگەڵ هاتنی بەریتانیا و بگرە کەمێک

PDF 4 KURD

پێش هاتنیشی کار لەسەر قرتاندنی ئەو ناوچەیە کراوە لە کوردستان، پاشان حکومەتە یەک لە دوای یەکەکان کاریان لەسەر ئەو سیاسەتە کردوە، ئەو کێشەیە لە ئاستی هەرێمی و جیهانیدایە بۆیە دەبینین تورکیا و وڵاتانی عەرەبی لەسەر هێڵن بۆ ئەو کێشەیە، کەواتە نەخشە و پلانێکی زۆر وردی دەوێ، جێی داخە ئەوە نەکراوە ڕەنگە دەسەڵاتی کوردی لە توانایدا نەبێ ڕاستەوخۆ و ڕاشکاوانە داوای مافی گەلی خۆی بکاتەوە و بڵێت کەرکووک کوردستانیە و ناوچە دابڕاوەکان کوردین و دەمانەوێ بگەڕێتەوە سەر کوردستان، وەک بینیمان بەرەیەکی عروبی بەهێز لە جیهان و بەرەیەکی تۆرانی هاوشێوەی و تەنانەت کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیش ئەوەندە هاوسۆزی ئەو خواستە نیین، بۆیە دەبێ ڕێگەو سیاسەتی دانایانە و زانایانە و دووربین و هەمەلایەن و قووڵبین بگرینەبەر، کار لەسەر ستراتیژی و سەرچاوەکان بکەین، بۆ ئەو مەبەستەش بەکورتی ئەو هەنگاوانەی پێویستە:

١. پێش هەموو هەنگاوێک پێویست بەوە دەکا کە دانیشتوانی ئەو ناوچە بە هەموو پێکهاتەکان لایەنگری ئەو مافە بن و بەختیاری چارەنووسیان لە گەڕانەوەی ئەو ناوچەیە بۆ سەر کوردستان ببینەوە، ئەوەش کۆمەڵێک هەنگاو و دەستپێشخەری تری دەوی، لەوانە: دروستکردنی نموونەی جوان لە ئەزموونی کوردستان لە ڕووەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و یاسایی و فەرهەنگی، وا بکرێت دادگەری و دیموکراسی هەبێ تێیدا جێی هەموو لایەک ببێتەوە، لەو ڕووەوە کەموکوڕی گەورە هەیە، دەسەڵاتی کوردی نەیتوانیوە سەرنجی دانیشتوانی ئەو ناوچانە ڕابکێشی، بۆیە برایانی تورکمان و ئاشووری و

لای تریش بەلای کەمی نەبوونە یارمەتیدەر، ڕەنگە پاساوی دەسەلاتی کوردی ئەوە بێت بەشێک لە سیاسیەکانی تورکمان بە ئەجێندای بیانی دژ بەمافی کوردن، ئەوەیان ڕاستە بۆ بەشێک، بەڵام ناکرێ سیاسەتی چەوتی خۆشمان بەرامبەر ئەوانە دەرنەخەین، هەندێکی بە نموونە باس دەکەین کە لە چوارچێوەی بابەتەکەیە:

أ. تا ئەو ساتە دەسەلاتی کوردی بەشدارییەکی ڕاستەقینەی بە کەمایەتیەکانی نەکردوە لە ئەزموونی کوردستان، دەبووایە جێگری سەرۆکی هەرێم و بەشێکی گرنگ لە حکومەتی هەرێم بدرابووایە بەوان، وەک پێویست نەبووە.

ب. گەلێ جار دەبینین ململانێیەکی توند لە نێوان کورد و تورکماندا سەبارەت بە ژمارەی تورکمان و خواستەکانیان ڕوودەدا و بە زیانی هەردوولاش تەواوبوە، ئەوەی لەسەر کورد پێویست بوو دەبووایە پشتیوانی هەر خواستێکی ماقوڵیان بکا، تەنانەت ئەگەر ئۆتۆنۆمی و فیدراڵیشیان داواکرد، خۆ ئەو مافە لای کورد نییە و کوردیش لێی نەخواردوە تا کورد بە سەلبی وەڵامی بداتەوە. ئەو مافە لای بەغدایە، خۆ ماف ئەگەر لە لای کوردیش بێت پێویستە بە جوانی بیداتەوە، ئینجا برایانی تورکمان هەرێمێکیان نییە تا داوای فیدراڵی و ئۆتۆنۆمی بکەن، کەواتە کێشەکە لە خودی تورکمان و لای بەغدایە ئیتر کورد بۆچی خۆی دەکاتە لایەن، دەبووایە پشتیگریی بکا بۆ هەموو ئەو خواستانەی لە بەغدا داوایدەکەن، بە پێچەوانە ئێستا بوەتە کار و کاردانەوەیەکی وا بەغدا و عروبیەکان و ئەوانەی غەدریان لە هەردوولا کردوە بە ئاسودەیی تەماشاکەرن.

PDF 4 KURD

٢. ئەو هەموو زەبر و زەنگ و ئەنفال و كیمیایی بەسەر كورددا هاتووە تا دەگاتە پلەی جینۆسایدەكە بە بڕیاری سەرۆكایەتی عێراق ژمارە (٢٦)ی ڕۆژی (١٠/ ٩/ ٢٠٠٨) ناسێندرا و پەرلەمانیش گەواهیدا.. هەموو ئەوانە بەكاربهێنرێ كە لەو ناوچانە ئەنجامدراون..

٣. ئەو كێشەیە شێوازێكی گرنگی وەرگرتوە كە ناوی نراوە (المناطق المتنازعة علیها)، ئەوە ئاستێكی ئیجابی وەرگرتوە، بەڵام سەلبیاتیشی هەیە كە هەستیت (دڵ و قودسی كوردستان!!) بدەیتە ڕاپرسی، ئینجا ساغكردنەوەی كەركووك و ناوچە دابڕاوەكان لە نێوان كوردستانیبوون و عێراقیبووندا ئەوا لەسەر ئاستی زۆرایەتیی ناوەخۆی عێراق و ناوچەكە و جیهان زیاتر عێراقیانەیان قەبووڵە لە كوردستانیبوونی، بۆیە دەبێ شێوازی گەلاڵەكردنی بگۆڕی، چاكترین فۆرمی ئەوەیە ئەو كێشەیە بخەیتە نێوان كوردستان و هەرێمێك لە عێراق، ئەویش هەرێمی عەرەبستانە، ئەوكاتی هەموو عێراقیەكان نابنە لایەك دژ بە كوردستان، ڕەنگە پێچەوانەش بێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو هەنگاوەش بێتەدی پێویست بەوە دەكا هەرێمی عەرەبی لە ناوچەكە دروستبێت، ئەوەش لە پرۆژەی عێراقی (٣) فیدراڵی دێتەدی، جێی داخە لە گەرمەی ئەو پرۆژەیە كورد ئەوەندە گرنگی (٣) فیدراڵی نەزانی و بگرە پێشی پەست ببوو، بۆیە داواكردنی عێراقێكی (٣) فیدراڵی خواروو و ناوەڕاست و سەروو دەروازەی چارەسەری ئەو كێشە ئاڵۆزەیە، ئەوكاتی لە توانای كورد دەبێ ئەو ناوچانە بگێڕێتەوە، ئینجا پاساوی یاسایی و مێژوویی و نێدەوڵەتیی كورد زۆر بەهێزتر دەبێ.

PDF 4 KURD

٤. به پاڵپشتی خالی (٢) وا پێویست بوو کوردستانێتیی ئەو ناوچە نەخرابووایە ماددەی (١٤٠) و ڕاپرسی، بەڵکو ڕاپرسیەکە لەسەر ئیدارەیەکەی بکرابووایە ئاخۆ خەڵکی ناوچەکە دەیانەوی بگەڕێنەوە سەر حکومەتی هەرێم یان حکومەتی بەغدا؟ ئەوەی ئێستا لە ماددەی (١٤٠) ڕاپرسیەکە لەسەر خاکەکەیە بۆیەش ناوی (مناطق المتنازع عليها) یە دەبووایە ناوی (إدارة المتنازع عليها) بووایە.

٥. گوتاری کورد ڕوو لە برایانی عەرەب خەلەلی گەورەی هەیە هەروەک گوتاری ئەوانیش ڕوو لە کورد چەوتە، لەو ناوە دوژمنانی هەردوولا و مەبەستەکانی سایکس پیکۆو (پلانی پەرتەوازەیی میللەتی ئیسلام) سەرکەوتوو دەبێت، ئەگەر برایانی عەرەب بیانەوی عێراق بە یەکگرتووی بمێنێتەوە ئەوا چۆن بە تەعریب و توانەوەی میللەتی کورد دێتەدی، دەبێ ئەوان هەوڵی پێکەوەنووسانی (إندماج) هەردوو نەتەوە بکەن نەک تواندنەوە (انصهار)، لە حکومەتە یەک لە دوای یەکەکان تائێستاش هەولی دووەم هەیە بەدەستووریش کراوە، لە ماددەی(١)ی دەستووری (١٩٦٨)[1].

هەرچی گوتاری هەڵەی کوردیشە ئەوەیە نابێ لە خۆڕا مێژووی برایەتیی کورد و عەرەب بشێوێنی گوایە ئەوان هەر کوردستانیان داگیر کردوە لە فەتحی یەکەمەوە تا ئێستا! ئیتر ڕۆژئاوا و ئیسرائیلیش بێتاوان پێشانبدات لەو گۆبەندەی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بەرپایانکردوە، تێیدا هەمولایەک بەکورد و عەرەبەوەیان مەغدوورکردوە، کەواتە ئەو

---

١. الشعب العراقي جزء من الأمه العربية هدفه الوحدة العربية الشاملة و تلتزم الحكومة بالعمل على تحقيقها.

کێشانەش بەرپاکراوە بۆ ئەوەی برایەتی کورد و عەرەب نەگەڕێتەوە، بۆیە چارەسەرکردنی دادپەروەرانە زیان نییە بە هیچ لایەک.

٦. هەر لە چوارچێوەی گوتاری کوردیدا، ئەگەر کورد داوای دەوڵەت بکات و ئاماژە بە جیابوونەوە بکات، ئەوا گەڕانەوەی زۆر قورستر دەبێ لەوەی کە گوتارەکەی مانەوە بێت لە عێراق.

٧. بەهەوەنتە نەهێڵێ عێراق لە بەندی (٧) دەرچێت پێش چارەسەرکردنی ئەو کێشانە.

٨. ئەو زانیاریانەی لەو نووسینە و چەندین کتێبی تردا هاتووە بەکاری بهێنی لە بوارەکانی سیاسی و یاسایی و لەسەر هەردوو ئاستی سەروو و خوارووی کورد و عەرەب و تورکمان و هەرێمی و جیهانی و لە ڕەوایی ئەو کێشەیە تێبگەیەنرێن.



PDF 4 KURD

